


جەنگیز ئیتماتۆڤ

# جەمیلە



تۆفیق عەبدول
لە ئینگلیزییەوە کردوویە بە کوردی





ڕۆمان

جوانترین چیرۆکی خۆشەویستی لە جیهاندا

جەنگیز ئیتماتۆڤ

١٨/١

# جەمیلە



تۆفیق عەبدول

لە ئینگلیزییەوە کردوویە بە کوردی

سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی رۆشنبیری ولاوان
بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەگشتییەکان
کتێبخانەی گشتی سلێمانی
بەشی سپاردن

ژمارە :
رۆژ :   /   /کوردی ٢٧١٩

هەرێمی کوردستانی عێراق
Kurdistan regional - Iraq
Council of ministers



رئاسة مجلس الوزراء
وزارة الثقافة والشباب
المديرية العامة للمكتبات العامة
المكتبة العامة/ السليمانية
ژمارە : ٢٦٢٩
بەروار : ١٩/ ١٢/ ٢٠١٩

بۆ/ ئاوەلدی رۆشنبیری لەدیبان

بابەت / ژمارەی سپاردن

بەپێی یاسای چاپەمەنی ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٢

ژمارەی سپاردنی( ٢٧٦٦ ) ی ساڵی ٢٠١٩ تەرخانکراوە بۆ کتێبی ( جەمیلە ) کە لە نووسینی ( جەنگیز ئەیتماتۆف )ە، وە لە وەرگێڕانی ( تۆفیق عەبدول )ە، بە تیراژی ( ١٠٠٠ ) دانە ، کە بابەتەکەی ( رۆمان )ە، بە مەرجێك (٥) دانە لە کتێبەکە بۆ بەشی سپاردن رەوانە بکرێت.

لەگەڵ رێزماندا



ئالان محمد رؤوف
بەڕێوەبەر

تێبینی:

١- دەستەواژەی سپاردن بەم شێوەیە لەسەر کتێبەکە چاپ بکرێت. لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردن ( ) ی ساڵی ٢٠١٩ ی پێدراوە.
٢- هەر چاپخانەیەك پابەند نەبێ بە ناردنەوەی (٥) دانە لە کتێبەکە، ژمارەی سپاردنی نادرێتێ.
٣- ئەم نووسراوە سکان بکرێت ولە دوا لاپەرەی کتێبەکەدا دابنرێت .

وێنەیەك بۆ/
- نوسینەی سپاردن


slemany1library@yahoo.com
www.slemanylibrary.com
ژمارەی تەلەفۆن/ ٣٢٠٢٧١٩




ADIBAN

## ناوەندی ڕۆشنبیری ئەدیبان

بەڕێوەبەری گشتی: نارامی مەلا محەمەد



**ناونیشان:** سلێمانی، شەقامی ئیبراهیم پاشا، تولکەی گۆزەکان نزیک ناوەندی ڕۆژهەڵاتی کوڕان.

**پەیوەندی:** 07701974656 - 07501590032 - 07731974646 - 07501696369.

**Email:** bookadiban@gmail.com

**Facebook:** https://www.facebook.com/eadiban/


### ناسنامەی کتێب


ناونیشان: جەمیلە.

نووسەر: چەنگیز ئیتماتۆف.

وەرگێڕانی: تۆفیق عەبدول.

هەڵەبڕی: باخان ئەحمەد.

بابەت: ئەدەبیاتی ڕووسی — سەدەی **20**م.

ژانر: ڕۆمان.

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم.

پەخشانگە: ناوەندی ڕۆشنبیری ئەدیبان.

ساڵی چاپ: **2020**میلادی.

تیراژ: **1000** دانەی لێ چاپکراوە.


---

# جەنگیز ئەیتماتۆڤ و ئایدیۆلۆژیای ژیان دۆستی و مرۆڤایەتی

ئەمەی لێرەدا دەست دەکەم بە نووسینی؛ شتێکە ناکرێت وەک مەرج لێی بڕوانرێت، بەڵام دەتوانم بڵێم تا ئەندازەیەک گرنگە.

لە کاتی خوێندنەوەی ڕۆماندا گرنگە ئەگەر دووربەدووریش بێت؛ بە ناوی نووسەرەکەی ئاشنا بیت، ناوی نووسەر وەک ژیاننامەکەی نا، کەی لە دایک بووە و چ جۆرە کارێکی کردووە و کەی چۆتە بەر خوێندن و... هتد، بەڵکوو ئاشنابوون بە بیرکردنەوەی، چۆنیەتیی دارشتنی تێکستەکان، مێژووی نووسینەکەی، دنیابینییەکانی و ئاستی ڕەنگدانەوەی ئەو قۆناغەی تیایدا ژیاوە.

ڕاستە خوێندنەوەی ڕۆمان پێویستی بە ژینگەیەکی ئارام هەیە، ئەو ژینگە ئارامەش شەو و ڕۆژ ناناسێت، چونکە تێکەڵبوونی خوێنەر لەگەڵ وشە بە وشە و دێڕ بە دێڕ و دیمەن بە دیمەنی ڕۆمانەکە؛ ئاوێزانبوونێکی ڕۆحییانەیە، ئەو سرووتەی خوێنەر تێی دەکەوێت؛ ڕۆشنایی و تاریکی دەوروبەری نابنە گرفت. لەو ڕوانگەیەوەی بە خۆی بزانێت یان نەزانێت؛ بۆتە بەشێک لە چنینی درامایی نێو ڕۆمانەکە و هەندێک جاریش

شانبەشانی کاراکتەرە سەرەکییەکان ڕێ دەکات و لەگەڵیاندا دەژی و هەستیان پێ دەکات، ئەمە ئەگەر خۆی بە کاراکتەری سەرەکییش نەزانێت.

ڕێک ئا ئێستا کە دەخوازیت دەست بکەیت بە خوێندنەوەی ئەم ڕۆمانەی جەنگیز ئەیتماتۆڤ (جەمیلە)، ئەگەریکی زۆر هەیە ئەو جۆرە هەستەت لا دروست ببێت کە ئەم پیاوە قەرغیزییە باس لە ژیانی تۆ دەکات بە هەموو هەڵکشان و داکشانەکانیەوە.

یەکێک لە ئەفسوونەکانی تێکستە ئەدەبییەکان و ڕۆمان بەتایبەتی ئەوەیە کە دەیان جۆر خوێندنەوەی بۆ دەکرێت و هەر خوێنەرە لە سۆنگەی تایبەت بە خۆیەوە دەکەوێتە باسکردنی ئەو تێکستە و لە تێگەیشتنی خۆیەوە ڕاڤەی ڕووداوەکان دەکات. لێرەوە سەرەتاکانی نانەوەی مشتومڕی ڕاستەقینە لە کۆمەڵگەدا دەست پێ دەکات، کە هەندێک جار هەژان و ڕاچڵەکینی کۆمەڵگەی بەدوادا دێت.

ئەم نووسەرەی وا ئێستا یەکێک لە کتێبە پڕ بەهاکانیت بە دەستەوەیە و دەخوازیت بەوردی بیخوێنیتەوە؛ هەشتا ساڵ لەسەر ئەم زەوییە زامدارە ژیا کە هەر مرۆڤ خۆی پیلانیان دژی دەچنی و دەیانگێڕا، بە بۆمب و مین و کردە قێزەونەکانی تریانەوە بریندایان دەکرد.

ژیـــانی جەنگیـــز ئەیتمـــاتۆڤ لە (١٩٢٨)ەوە لە قرغیزستان دەست پێ دەکات، لە ٢٠٠٨ لە نۆرینبۆرگ لە ئەڵمانیا کۆتایی دێت.

ئەیتماتۆڤ لە پێناو داکۆکیکردن لە مافەکانی مرۆڤ و لە مافی بەها بەرزەکانی ژیان و ئەو ژینگەیەی مرۆڤ دەپارێزێت؛ ژیا، ئەمەش وەهای کردووە کە ڕۆمانەکانی تایبەتمەندێتیی خۆیان هەبێت و ببنە جیهانی و بشچنە خـانەی ئەو ڕۆمانـانەی دەشـێت بە ڕۆمـانی مرۆیـی ناودێر بکرێن.

ئەیتماتۆڤ بڕوایەکی تەواوی هەبووە بەوەی گەیشتن بە جیهـانیبوون نیـیە، ئەگەر پێناسـەکانی خۆجێییبـوون ئەزبەر نەکرابن، هەر بۆیە ئەیتمـاتۆڤ بایەخێکی زۆری داوە بە نـاوچەکەی خـۆی و باسـی لە ژیـانی سـەختی ئەوە لەدوای ئەوەی کردووە.

ڕۆشنبیریی میللی؛ ژێرخانی ڕۆمانەکانیەتی، زەمینەی قووڵی داهێنانە ئەدەبیەکەیەتی کە تێگەیشتن لێی ئاسـان نییە ئەگەر بێتوو تێگەیشتن لە پاشـخانی بیرکردنەوەی قووڵی ئەم نووسەرە لای من و تۆی خوێنەر ئامادەیی نەبێت.

هـزر لە ڕۆمانەکانیدا، کۆمەڵگەی قرغیزستانی خستە بەردەم ئەزمـوونی قورسـی نـوێگەرایی. کـۆمەڵگە و هەروەهاش ئەو نوێگەراییەی لە هەڵکشاندا بوو؛ ئێجگار

لێـک دوور بــوون، وەک بڵێــی هەریەکەیــان لە دنیــای خۆیاندا ئیشیان لەسـەر خۆیان دەکرد و بەبێ گوێدانە یەکتر. بەڵام پێدەچێت نوێگەرایی توانیبێتی بە تێکۆشانی ڕاسـتەقینەی کاراکتەرەکـانی ململانێکەی خـۆی، لە دنیـا باوەکەی کۆمەڵگەی قرغیزستان بباتەوە.

ئەگەرچـی ئەم نووسـەرە جیهـانییە لە سـەروەختەکانی شـەڕی سـارددا ژیـاوە و کەسـێکی ئاگـادار بـووە لە وردەکارییەکــــــانی، بەڵام خــــــاڵی هەرە گەورەی ســــــەرکەوتنی ئەم نووســــــەرە ئەوەیە دەرگـــــا و پەنجەرەکانی لە ئایدیۆلۆژییەکان داخست و ڕێگەی نەدا ببنە بەشێک لە ژیانی هەمیشەیی ڕۆمانەکانی.

ڕۆمانی "ڕۆژێک لە سـەدەیەک درێژتر"، چارەنووسـی تەواوی مرۆڤـایەتی دەخـاتە ژێـر پرسـیار و گومـانەوە. هەر لەم ڕۆمانەیـدا دیـاردە بـاوەکەی ئەو سـەروەختەی کۆمارەکــانی یەکێتیــی ســۆڤیەتی پێشــووی پــێچەوانە کردەوە و ئایدیۆلۆژیای خستە خزمەتی ئەدەبەوە و ملی بە ئایـدیۆلۆژیا کەچ کـرد لەبەردەم دەقـی بـاڵادا. ئەمەش جیــــاوازییە گەورەکەی ئەیتمــــاتۆڤ بــــوو لەگەڵ نووســـەرەکانی تـری سـەروەختی خۆیـدا، کە لە ڕووی فەرهەنگـی و ڕۆشنبیرییشـەوە ڕچەشـکێنییەکی دەگمـەن بوو.

ئەیتمــــاتۆڤ هەر زوو ڕێــــگەی نەدا ڕۆمــــان و نووســــینەکانی ببــــنە ماڵێــــک بــــۆ درووشــــمە

باقوبریقەدارەکـــان، یـــان وتـــارە سادەوســـاکارەکانی دەستبەرداری زمـانی ستایشئامێز نـابن، کە ئەو جۆرە ڕەشکردنەوەیەی لاپەڕەکـان دەبنە هۆکـاری سـەرەکیی لەباربردنی پەیوەندییە ئۆرگانییەکانی نێوان نووسـەر و خوێنەر.

ئەوەی ئەیتمـــــاتۆڤ دەخـــــوێنێتەوە؛ دەزانێـــــت چ ڕووبەرێکـــی گەورەی کـــردۆتەوە بـــۆ مرۆڤـــایەتی و جوانکارییەکـــان، بە شـــێوەیەک کە دەکرێـــت بڵـــێم لای ئەیتماتۆڤ سـەرەتا مرۆڤە و کۆتاییە کراوەکانیشـی هەر مرۆڤن.

لە یەکێک لە ڕۆمانەکانیدا (یەکەم مامۆستا - دیۆشین) پـاڵەوان هەوڵ دەدات بەخێرایـی کـۆمەڵگە دەسـتلەملانی بێرۆکەکـــانی کـــۆمەڵگەی نـــوێ بێـــت، لە کاتێکـــدا کۆمەڵگەکەی لە قۆناغە هەرە بەراییەکاندایە و پەیونـدیی نییە بە خوێندنگا و بە جیهانیشەوە.

یان لە ڕۆمانی "کەشتیە سپییەکە" منداڵێک چاوەڕوانی کەشـتییەکی سـپییە و هەر نـایەت، وەک خـۆی دەڵێـت خەونە و درەنگ دێتە دی.

"خوداحـــافیز گوڵســـاری"، ئەیتمـــاتۆڤ لەم ڕۆمانەیـــدا لەســـەر پەیوەنـدیی مـرۆڤ و ئـاژەڵ ئیشـی کـردووە، بەتایبەتی لەسەر پەیوەندیی ئەسپ و خاوەنەکەی و ئەو پرسیارەی لای خوێنەرانی دروست کرد چۆن ئەسپێک

مەزنتر و میهرەبانتر و بەسۆزتر دەبێت لە خاوەنەکەی، ئایا مرۆڤایەتی هەر تەنها لای مرۆڤەکانە؟

زۆربەی ڕۆمانەکانی جەنگیز ئەیتماتۆڤ بووبوونە ڕووداوێکی ڕۆشنبیری و بەردەوام مشتومڕی بەدوای خۆیاندا هێناوە.

زۆرینەی ڕەخنەگران و لێکۆڵەرەوەکان لەو بڕوایەدان ڕۆمانەکانی ئەیتماتۆڤ کاریگەریی گەورەیان هەبووە لە گۆڕینی واقیعیەتی ڕووتدا بۆ واقیعیەتێکی ئەفسوونی. لەپێش نووسەرانی ئەمەریکای لاتین ئەم دیاردەیە لای ئەیتماتۆڤ هەبووە، بەڵام وەک چۆن دەشێت سیاسەت بووبێتە تەگەرەیەکی گەورە لەبەردەم ئەوەی خەڵاتی نۆبڵ وەربگرێت؛ ئاوەهاش ئەورووپای ئەوسا دەشێت یەکێک بووبێت لە ڕێگریەکان لەبەردەم ناساندن و پێناسەکردنی داهێنانەکانیدا.

"تۆفیق ئەحمەد عەبدول": وەرگێڕی ڕۆمانەکانی (جەمیلە، چیای سەگەبازوو، هەورە سپییەکەی جەنگیز خان و کەشتیە سپییەکە... و ئاگادارم ئێستاش خەریکی وەرگێڕانی ڕۆمانی شەشەمە) لە ڕۆمانەکانی جەنگیز ئەیتماتۆڤ، دەزانێت بۆچی دەستدەداتە ئەو ڕۆمانانەی ئەیتماتۆڤ و لە پێناوی چیدا وەریاندەگێڕێت بۆ کوردی.

وەرگێڕانی دەقی فەرهەنگی جا لە هەر ژانرێکدا بێت، دەکرێت وەک یەکێک لە ئەرکە هەرە قورس و گرنگەکان لێی بڕوانرێت، لەو سۆنگەیەوەی ئاڵوگۆڕێکی بابەتییانەی دید و بۆچوونەکانە و ئاشنا بوونە بە بەها بەرزەکانی تێکستە ئەدەبی و هونەرییە جیهانییەکان.

ئەرکی وەرگێڕان وەک زۆرێک لە وەرگێڕەکان جەختی لێ دەکەنەوە؛ هەر تەنها بە زانینی زمانی دایک و زمانێکی بیانی ناتوانرێت وەرگێڕانێکی سەرکەوتووانە بەرهەم بهێنرێت، بەڵکوو پێویستی بە زانینێکی زۆری کولتوورەکانی تریش هەیە، پێویستیشی بە چۆنیەتیی بەکارهێنانی ئیدیۆم و خوێندنەوەی شتە پەنهانەکانی نێوان دێڕەکان هەیە، ئەمانە بێ لەوەی کە دەبێت لە کاری وەرگێڕاندا ژینگەیەکی هاوشێوەی تێکستەکە دروست بکرێتەوە.

لەمڕۆی فەرهەنگی کوردیدا بەرهەمگەلێکی وەرگێڕدراو دەبینین، بەڵام هەندێکیان هێندە زمانێکی وشکوبرینگ و بێزارکەری تیادا بەکار هاتووە؛ ئیدی خوێنەر وەها لێ دەکات ئەو تێکستەی لەبەرچاو بکەوێت، تەنانەت ئەگەر تێکستێکی جیهانییش بێت. وەرگێڕانیش هەن هێندە بە زمانێکی پاراو و بێ گرێوگۆڵ نووسراون، ڕێک خوێنەر هەست دەکات نووسەرێکی باڵای کورد ئەم تێکستەی نووسیوە و خودی وەرگێڕ سرووتێکی لە هەناوی ژینگەی

تێکستەکەوە هێناوە و دەیخاتە بەردەم خوێنەران کە خوێنەر بەسانایی هەست بە یاریکردنە جوانەکان لەنێوان دوو زماندا دەکات و دەتوانێت پەیوەندییە ئۆرگانییەکانی نێوان دیمەن و وشەکان بدۆزێتەوە و ئاماژە و هێماکانی نێوان کولتوور و فەرهەنگە جیاوازەکان بەڕوونی دەبینێت. بۆ خوێنەر زۆر گرنگە لە دەقی وەرگێڕدراودا ڕایەڵەکانی نێوان هزر کە لە بیرۆکەکاندا وێنا دەکرێن؛ لەگەڵ کردارەکاندا ببینێت، لەو ڕووبەرە جوگرافیاییەی چنینە دراماییەکەی تیادا ڕوو دەدات.

دەکرێت بڵێم هاوڕاییەکی زۆر هەیە لەسەر ئەوەی ئەگەر هاتبا وەرگێڕانەکان نەبوونایە، ئەوا دەمێک بوو ژانرە جیاوازەکانی فەرهەنگ و کولتوور وەک: ئەدەب، شانۆ، فەلسەفە، ڕەخنە، لیکۆڵینەوەکان لەسەر شارستانییەکان، نووسین لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا؛ دەبوونە جەستەیەکی ساردوسڕی ناو سنوورێکی دیاریکراو.

وەرگێڕان هیچی کەمتر نییە لە نووسینی دەقێک، وە زۆر جاریش بووە کە وەرگێڕێک دەڵێت هێندەی نووسینی چەند ڕۆمانێک؛ بەدەست وەرگێڕانی ئەم ڕۆمانەوە ماندوو بووم، بۆ شیعر و چیرۆک و تێکستە ئەدەبییەکانی تریش هەر ئاوەهایە، چونکە وەرگێڕی سەرکەوتوو دەخوازێت لەگەڵ داڕشتنەوەیەکی

بابەتییانەی تێکستەکاندا؛ چێژی بابەتەکەش بپارێزێت و بتوانێت سەرنجی خوێنەر بەلای خۆیدا ڕابکێشێت و کارێکی وەهاش بکات تا کۆتایی دەقی وەرگێڕدراو خوێنەر لەگەڵیدا بمێنێتەوە.

با لێرەدا بڕێک باس لە کردەی وەرگێڕان بکەین لە زمانێکی بیانییەوە بۆ سەر زمانی کوردی، یەکێک لە کۆڵەکە هەرە گرنگەکانی ئەم جۆرە وەگێڕانە ئەوەیە کە جارێکی تر ئەو تێکستە بە کوردی دابڕێژرێتەوە، وەک بڵێی پرۆسەکە پرۆسەی بەکوردیکردن بێت نەک ئەوەی وشە بە وشە یان دێڕ بە دێڕ بکرێت بە کوردی.

هێندەی ئەوەی بەشێک لە ڕۆمان و شانۆنامە بەکوردیکراوەکانی "تۆفیق ئەحمەد عەبدول"م خوێندوونەتەوە بە "جەمیلە"شەوە، ئەگەر هاتبا و ناوی نووسەری یەکەمی لەسەر نەبووایە؛ ئەوا ڕێک دەمگوت وەرگێڕ خۆی نووسیونی، چونکە بەبێ ئەوەی دەستکاریی ناوەرۆکی کردبێت یان ڕووداوەکان بە ئارەزوو و خواستی خۆی بگۆڕێت، هێندە بە زمانێکی پاراوی کوردی کاری لەسەر کردوون؛ ڕێک وەک ئەوەیە نووسەرێکی کورد بە شارەزاییەکی زۆری زمانەوە ئەو تێکستەی نووسیبێت.

بەڕێز عەبدول، بە پێچەوانەی هەندێک وەرگێڕی ترەوە، لە پێناو وەرگێڕاندا نایەت خۆی بخاتە بۆتەی دەستەواژەی وشکوبرینگەوە، بەڵکوو ماندوو دەبێت و دەگەڕێت بەشوێن دۆزینەوەی دەستەواژەیەکدا کە پڕ

به پێستی مەبەستەکەی بێت، تا خوێنەر وەڕس نەکات لە کاتی خوێندنەوەدا.

دەشێت ئەمە بە وتن سانا بێت لە کاتێکدا دەستی نووسەری دەق ئێجگار والاترە بۆ داڕشتن، بەڵام ئەو دەستکراوەییە بۆ وەرگێڕ ئێجگار سنووردارە، ئەمە بێ لەوەی ئەگەر نووسەر نەیتوانی ئەو بیرۆکەیەی هەیەتی لە پەرەگرافێکدا وێنای بکات بەو شێوەیەی دەیخوازێت؛ ئەوا لەوانەیە هەر بەتەواوەتی لە نووسینەکەیدا خۆی لەقەرەی نەدات، بەبێ ئەوەی خوێنەر پێی بزانێت، بێگومان ئەمە لە وەرگێڕاندا کاری کردە نییە لەو ڕوانگەیەوەی ئەرکەکە بەرپرسیارێتییەکی ئاکاریانەیە بەرامبەر بە مافی نووسەر و دەربڕینەکانی نووسەر.

"تۆفیق ئەحمەد عەبدول" وەک یەکێک لە وەرگێڕە سەرکەوتووەکان، لە وەرگێڕانەکانیدا کە لەسەر پرەنسیپی بەکوردیکردن کاریان لەسەر دەکات، هەمیشە ئەو تێکستانەی لە زمانەکانی ترەوە وەریاندەگێڕێت؛ ژینگەیەکی کوردانەیان بۆ دروست دەکات و بە کوردییەکی پاراویشەوە دەیاننووسێتەوە و تایبەتمەندێتییەکی کوردانە و چێژێکی کوردانەشت پێ دەبەخشێت، ئەمانەش بێ لەوەی وەک خوێندنگەیەکی زمانیش بە وشە و دەستەواژەی کوردییەکی ڕەسەن ئاشنات دەکات و فێریشمان دەکات.

ئەمەش بەڵگەیەکی نکۆڵیلێنەکراوە کە "تۆفیق ئەحمەد عەبدول" لە زماندا قاڵ بۆتەوە و زۆر هانا ناباتە بەر

وشە بیانییەکان یان داتاشینی وشە، بەڵکوو هەوڵێکی ماندوونەناسانە دەدات تا وشەیەکی کوردی بۆ دەدۆزێتەوە و لەوەش گرنگتر دەزانێت هەر یەکێک لەو وشانە؛ چۆن و لە کوێی ڕستە و پەرەگرافەکاندا بەکار بهێنێت.

یەکێک لە بەهرە و تایبەتمەندێتییەکانی تری تۆفیق ئەحمەد عەبدول؛ دەستگرتنی کاراکتەرەکان و پاڵەوانەکانی تێکستەکانە کە وەریاندەگێڕێت، ڕێک وەک بڵێی پێشتر دۆستایەتییەکیان لەگەڵدا دروست دەکات و دەیانکاتە هاوڕێ و پێیان دەڵێت لەبیرتان نەچێت بۆ لەمەودوا بە زمانێکی نوێوە لەگەڵ خوێنەرانی ئێمەدا دەکەونە ئاخاوتن، ئیدی لەوەودوا دەبینیت هەمان ئەو پاڵەوانە، هەمان ئەو کاراکتەرانە بە بەرگی کوردییەوە لە منداڵدانی زمانەوە بە گەورەیی، وەک خۆیان چۆنن، ئاوەها دەکەونە ناو چنینی درامایی دەقەکانی نیشتمانی خۆیان، بەڵام بە زمانێکی جودا.

ئەمەیە ئەفسوونی ئەو وەرگێڕانانەی لای "بەڕێز عەبدول" بۆتە "بەکوردیکردنی دەق"، وەک ڕۆمانی "جەمیلە" کە ئێستا یان کەمێکی تر دەست دەکەیت بە خوێندنەوەی!

بەڵێن ساڵح

ڕادیۆی دەنگی ئەمەریکا

واشنتۆن دی سی

بۆ کەسوکارم،

هاوتەمەنەکانم،

باوباپیرانم،

براکـــانم؛ ئەوانەی لە پـــاڵتۆی ســـەربازیدا گەورە بوون،

لەگەڵ خزمە ڕیشسپییەکانمدا.

ئەوەتا جارێکی تر بەرامبەر ئەو تابلۆ بچکۆلە چوارچێوە ساکارە وەستاوم، ئەبێ سبەینێ بەیانی بچمەوە بۆ ئاوایی، وا زۆر و ورد سەیری تابلۆکە ئەکەم، وەکوو ئەوەی بتوانێ دەربارەی سەفەرەکەم ئامۆژگارییەکم بکات.

پێشتر هەرگیز ئەو تابلۆیە نمایش نەکراوە، جگە لەوەش کاتێک خزمەکانم لە ئاواییەوە سەرم لێ ئەدەن؛ سوورم لەسەر ئەوەی کەس نەیبینێت. شتێکی تیا نییە جێی شەرمکردن بێت، بەڵام بەحاڵ لە هونەر ئەچێت، ئەوەندە ساکارە بەقەد ئەو خاکەی تیا نەخشێنراوە.

قووڵایی تابلۆکە، بەشێک لە ئاسمانی کاڵی پاییزییە و ڕەشەبا نیشتۆتە سەر گەلەهەورێکی بازوو کە خێرا بەسەر زنجیرە شاخە دوورەکەدا ڕائەکەن.

لە پێشەوەش دەشتێکی بە وشترخۆری ڕەنگ شەرابی داپۆشراو، ڕێگایەکی ڕەش کە لەدوای بارانەکەی ئەم دواییەوە هێشتا وشک نەبۆتەوە، لەگەڵ پووشێکی وشکی دەرزیلەیی بریقەداری پێپەستکراو لە هەردوو بەری ڕێگاکە.

بە درێژیی جێ پێچکەی عەرەبانەکان؛ لە دواوە جێ پێی دوو ڕێبوار بەجێ ماوە، تا دوورتر بکەوێتەوە؛ کاڵتر ئەبێتەوە، دوو ڕێبوارەکەش یەک هەنگاوی تریان

بنایە؛ لە تابلۆکە ئەچوونە دەرەوە، یەکێکیان... با پێش ڕووداوەکان نەکەوم.

ئەمە کاتێک ڕووی دا من هێشتا لاو بووم، ساڵی سێهەمی جەنگ بوو، باوکان و براکانمان لە بەرە دوورەکان دژی دوژمن لە جەنگا بوون، لە شوێنێک نزیک کۆرسک و ئۆرڵ.

بەڵام ئێمە کوڕانی پانزە ساڵ، لە کێڵگە هەرەوەزییەکان کارمان ئەکرد. ئەبوو وایە شانە ناسکەکانمان بدایەتە بەر کارە ناڕەحەتەکانی پیاوە گەورەکان. وەرزی دروێنە لە هەمووی ناڕەحەتتر بوو، ئەبووایە بە درێژایی هەفتە لە ماڵەوە نەبووینایە، شەو و ڕۆژمان لە کێڵگە بەسەر بردایە، یان لە گەلەخەرمانەکە یان بە ڕێگای وێستگەی شەمەندەفەرەوە گەنممان بگوێزایەتەوە.

یەکێک لە ڕۆژە هەرە گەرمەکان، کە داسەکانمان لە درەوەکەدا سوور ئەبووەوە، لە وێستەگەی شەمەنەفەرەکەوە بەخاڵی ئەگەڕامەوە، وتم سەرێک لە ماڵەوە بدەمەوە.

لە کۆتایی جادەکە لەسەر تەپۆلکەیەک نزیک بوارەکە، دوو خانووی لێ بوو بە دیوارێکی پتەوی خشتی کاڵ[1] حەوشەی بۆ کرابوو و بە سپی چناری بەرز دەورە درابوو، ئەوە ماڵەکانی ئێمە بوو. بۆ چەندین ساڵ

خێزانەکانمـان بەپـاڵ یەکەوە ئەژیـان. مـن لە خـانووە گەورەکەیانـا بـووم. دوو بـرام هەبـوو، هەردووکیـان لە مـن گەرەتـر بـوون، هیچیـان ژنیـان نەهێنـابوو، هەردووکیشـیان سـەرباز بـوون لە بەرەکـانی جەنـگ، ماوەیەکی زۆریشە هیچ کامیان هەواڵێکیان نییە.

باوکم دەمێک بوو دارتـاش بـوو، دوای ئەوەی نـوێژی بەیـانیی ئەکـرد؛ ئەچـوو بـۆ دوکـانەکەی لە شـوێنێکی بەرچـاو و هەتـا درەنگـانی ئێـوارە نەئەهـاتەوە، خوشکەکەم و دایکم نەبێ؛ کەس لە ماڵ نەئەبوو.

مـاڵەکەی تەنیشـتمان یـان مـاڵە بچکـۆلەکە وەک لە ئاواییـا پێـی ئەڵێن، خزممـان بـوون. لەوانەیە باپیرەمـان یان باپیرەی باپیرەمان برا بووبن، بەڵام من پێیـان ئەڵێم خزمان، چونکە وەکوو یەک خێزان ئەژیاین.

هەر لە سـەردەمی گەرمیـان و کوێسـتان کردنمـانەوە عادەتمان وا بووە باوباپیرانمان لە یەک هەوار دەواریان هەڵداوە و بەیەکەوە ماڵاتیان لەوەڕاندووە، ئێمەش دوای ئەوان ئەو نەریتەمـان پاراسـتووە.کاتێک کـۆمەڵەی هەرەوەزی گەیشـتە ئـاوایی، باوانمـان جێگیـر بـوون و لەتەنیشت یەکەوە ژیاون. نەک هەر ئێمە، بەڵکوو هەموو دانیشتووانی شەقامی ئەرلسکایا کە ئاوابییەکەی لە بـاری درێـژی ئەبەسـتەوە بە چەمەکەوە، چـونکە ئـێمە هەموومان سەر بە یەک هۆز و تیرەین.

هەر دوای ئەوەی پەیوەنـــدیمان کـــرد بە کـــۆمەڵەی هەرەوەزیـــیەکەوە؛ گەورەی مـــاڵە بچکـــۆلەکە مـــرد، بێوەژنێک و دوو کوڕی بچووکی لەدوای خۆی بەجێ هێشت. بەپێی دابونەریتی خێڵەکیی کۆن کە هێشتا لای ئێمە پەیڕەو ئەکرا، نەئەبوو بێوەژنێک منداڵی نێرینەی بێت خێڵەکە بەجێ بێڵێت، لەبەر ئەوە بڕیار درا باوکم مارەی بکاتەوە.

ئەمەکی باوکم بەرامبەر گیانی باوباپیرانی؛ ناچاری ئەکرد ئەو کارە بکات، چونکە ئەو نزیکترین خزمی خوالێخۆشبوو بوو.

بەو پێیە ئێمە بووین بە خاوەنی خێزانی دووەم، ماڵە بچکۆلەکە بە خـانوو و ڕان و زەویـوزارەوە دانـرا بە مـــاڵێکی ســـەربەخۆ، بەڵام لە ڕاســـتیدا هەر بەیەکەوە ئەژیاین.

ماڵە بچکۆلەکەش هەردوو کوڕەکەی ڕەوانەی جەنگ کرابـوون، گەورەکەیـان سـادق[٢]؛ مـاوەیەکی کەم دوای ژنگواستنەوە ڕەوانە کرابوو. نامەیان ئەهات، بەڵام زۆر کەم و درەنگ.

واتە ماڵە بچکۆلەکە تەنیا دایکەکەی تیا بوو کە من پێم ئەوت "کیچنە"[٣] لەگەڵ بووکەکەیا؛ ژنەکەی سادق، هەردووکیان لە بەیانییەوە تا ئێوارە لە هەرەوەزییەکە ئیشیان ئەکرد. دایکە گەنجەکەم ژنێکی چاک، لەخۆڕازی

و زۆر کەم هەڵئەچوو، لە هەموو شتێکا شانبەشانی ژنە گەنجەکان ئیشی ئەکرد، ئیتر جۆگەلێدان بووایە یان ئاودانی زەرعاتەکان.

چارەنووس پاداشتی دابووەوە و بووکێکی ئیشکەری پێ بەخشیبوو. جەمیله[٤] هاوکارێکی باش بوو بۆ خەسووی، ماندووبوونی نەئەناسی و زیرەک بوو، هەر چەند تەبیعەتی جیاواز بوو.

من جەمیلەم زۆر خۆش ئەویست، ئەویش منی خۆش ئەویست، دوو هاوڕێی نزیک بووین، لەگەڵ ئەوەشدا پڕکێشیمان نەئەکرد یەکتری بە ناوی خۆمانەوە بانگ بکەین. ئەگەر لە دوو خێزانی جیاواز بووینایە، ئەمتوانی بانگی بکەم "جەمیلە"، بەڵام لەبەر ئەوەی ژنی برا گەورەکەم بوو؛ پێم ئەوت "ژنێ" -براژن، ئەویش لە بەرامبەردا بە منی ئەوت (کیچنی بالا[٥] -کوڕە بچکۆل). هەر چەند منال نەبووم و تەمەنمان شتێکی وای جیاواز نەبوو، ئەوە نەریتی ئاواییەکەمان بوو ژنان بە برای بچووکی مێردەکانیان ئەوت کیچنی بالا.

دایکم هەردوو ماڵەکەی ئەبرد بەڕێوە. خوشکە بچکۆلەکەم -کچێکی ڕووخۆش بوو، دوو پەلکەی شۆڕی بەر دابووەوە و بە پەرۆ بەسترابوون- یارمەتیی ئەدا. هەرگیز لەیادم ناچێت لەو چەند ساڵە نارەحەتەداچەند ئیشی قورس بوو، ئەو بوو ڕان و گایەلی هەردوو ماڵەکەی ئەلەوەڕاند و ئەو بوو تەپاڵە و

چیلکەی کۆ ئەکردەوە بۆ ئەوەی بەردەوام لە ماڵەوە سووتەمەنیمان لێ نەبڕێت. ئەوە خوشکە بچکۆلە - لووت پان-ەکەم بوو ڕۆژگارەکانی تەنیایی دایکمی ڕووناک کردبووەوە، خەم و خەفەتی دووریی دوو کوڕەکەی و بێ هەواڵییانی لەبیر بردبووەوە.

خێزانە گەورەکەمان قەرزاری ماندووبوونی دایکمن لەو یەککگرتوویی و ئاوەدانییەی ماڵەکەمان، ئەو کەیبانووی دەسەڵاتدار و پارێزەری هەردوو ماڵەکە بوو.

ئەو زۆر مناڵ بووە کاتێک هاتۆتە ماڵە کۆچەرییەکەی باپیرانم و هەمیشە یادیانی بەرز ڕاگرتووە و کاروباری هەردوو خێزانەکەی دادپەروەرانە بەڕێوە بردووە.

ئەو دانایی و دادپەروەری و دەستپێوەگرتنەی ماڵەکەی پێ بەڕێوە ئەبرد، ئەو پایەیەی دابوویە لە کاروباری ئاواییەکەدا قسەی هەبێت.

لە ماڵەوە دایکم بەرپرس بوو لە هەموو شتێک، قسەی خۆمان بێت ئەهلی ئاوایی هەرگیز باوکمیان بە سەرۆکخێزان دانەناوە.

زۆر جار ئەیانوت: "ئا، مەڕۆن بۆ لای وەستاکە (Ustaka)، ئەو تەنیا هەر ئەزانێ تەشوێ بەکار بێنێت. دایکە گەورەکەیان بەرپرسە لە هەموو شتێک، باشترە بچیت بۆ لای ئەو."

لەگەڵ ئەوەشدا تەمەنم کەم بوو؛ قسەی خۆم هەبوو لە بەڕێوەبردنی ماڵدا، تەنیا لەبەر ئەوەش ڕێم پێ ئەدرا، چونکە برا گەورەکانم لە ماڵەوە نەبوون و لە جەنگ بوون.

هەندێ جار بە تەوسەوە و زۆر جار بە ڕاستی پێم ئەوترا "کۆڵەکەی دوو خێزان" و پارێزەر و نانپەیاکەر. شانازیم بەوەوە ئەکرد و زۆر هەستم بە بەرپرسیارێتی ئەکرد، جگە لەوەی دایکیشم زۆر هانی ئەم هەستکردن بەم لێپرسراوێتییەی ئەدام، ئەیویست جووتیارێکی باش و زیرەک و بە هەوڵ و تەقەلا بم، نەک پیاوێکی وەکوو باوکم کە ڕۆژ تا ئێوارە بە بێدەنگی خەریکی داربڕینەوە و ‌دارداتاشینە.

دواتر عەرەبانەکەم لە سێبەری چنارێکا وەستاند و ڕەشمەکانم شل کردەوە. کاتێک بەرەو حەوشەکە چووم، "ئوروزمات"ی سەرۆکێتیمم دی بەسەر ئەسپەکەیەوە و وەک هەمیشە دارشەقەکەی لە زینەکە هەڵبەستبوو. دایکم لە تەنیشتیەوە وەستابوو، قسەیان ئەکرد. کە نزیک بوومەوە، گوێم لە دایکم بوو ئەیوت: "هەرگیز! کابرا، تۆ لە خوا ناترسی؟ کێ بە حەیاتی بیستوویەتی ژنێک بە عەرەبانە فەردە گەنم بگوێزێتەوە؟ نەخێر، پیاوی چاک بە واز لە بووکەکەم بێنە، با هەر لەسەر ئیشەکەی خۆی بمێنێتەوە. من ڕۆژی سەعاتێک وچان نادەم، وەرە ماڵێک بەڕێوە بەرە لە دوو خانووا،

بەس نییە ئێستا تۆزێک کچەکەم گەورە بووە ئەتوانێ یارمەتییەکم بدات! یەک هەفتەیە ناتوانم ڕاست ببمەوە، ئەوەنە پشتم یەشێت وەکوو ڕۆژ تا ئێوارە قاڵیم[٦] بریبێت. سەیری گەنمەشامییەکەش بکە، خەریکە لە تینووا وشک ئەبێ!" ئەمەی بەناڕەزاییەوە وت و لکی سەرپۆشەکەی ئەخستە ناو یەخەی کراسەکەی، وەکوو هەر کاتێک کە تووڕە ئەبوو.

"تۆ تێناگەیت؟" ئوروزمات بەبێئومێدییەوە وتی، لە کاتێکا خۆی بە پێشا ئەنوشتاندەوە: "تۆ لەو بڕوایەدای من لەجیاتیی ئەم دارشەقە قاچم بووایە، ئەهاتم داوای ئەوەم لە تۆ بکردایە؟ خۆم فەردەکانم بار بکردایە و ئەسپەکانم لێبخوڕیایە باشتر نەبوو، وەکوو جاران ئەمکرد! ئەزانم ئەوە ئیشی ژن نییە، بەڵام پیاو لە کوێ بێنم؟ ئەوە بۆیە ڕوو لە ژنانی سەربازەکانمان ئەنێم. تۆ ناتەوێت بووکەکەت یارمەتیمان بدات، بەڵام من بەڕێوەبەری کێڵگەکەمان لە کۆڵم نابێتەوە. سەربازەکان نانیان ئەوێت، کەچی ئێمە بەرنامەکە پەک ئەخەین. تۆ لەمە ئەگەیت؟"

لێیان نزیک بوومەوە و قامچییەکەم بە زەویدا ڕائەکێشا.کاتێک سەرۆکتیمەکە منی دی؛ گەشایەوە و زۆری پێ خۆش بوو، دیار بوو بیرۆکەیەک هات بە خەیاڵیا.

"باشــه مــادام تــۆ ئەوەنە خەمــی بــووکەکەتە، ئەوە هێوەرەکەیەتی[٧] -بەدڵخۆشییەوە ئاماژەی بۆ من کرد- نــایەڵێ کەس پەنــجەی بــۆ بەرێت. مەترســە! ســەییت[٨] کەســێکی بەغیــرەتە. ئەم کوڕانەمــانن نانمــان بــۆ پەیــا ئەکەن و لە چاوی ئەوانەوە سەیرمان ئەکەن."

دایکم گوێی لێ نەگرت.

"ئــۆف خــوایە، تــۆ بەس ســەیری خــۆت بــکە، ئەڵێــی ســوالکەری!" ڕووی کــردە مــن و بەگلەیــیەوە وتــی: "قژیشــت ئەوەنە درێــژ بــووە، بیهــۆنەرەوە! باوکیشــت ئەوەنە ئیشکەرە، بواری ئەوەی نییە سەری کوڕەکەی بتاشێت."

"باشە، کەواتە، با ئەمڕۆ کوڕەکە لەماڵەوە ئیسراحەت بکا لای دایک و باوکی و سەری بتاشێت." ئوروزمات بە هەمان تۆنی دایکم وتی: "سەییت، تۆ ئەمڕۆ لە مـاڵەوە بە، ئەســــپەکانت ئالیــــک بە، ســــبەینێ بەیــــانییش عەرەبانەیەک ئەدەین بە جەمیلە، هەردووکتان بەیەکەوە ئــیش ئەکەن، بەڵام لەبیــرت نەچــێ تــۆ بەرپرســی ئەو ئەبیت! ئێستا ئیتر خەمت نەبێت بـایبیچە[٩] (baibiche)، سەییت باش ئاگای لێی ئەبێت، جگە لەوەش دانی یار[١٠] (Daniyar)یــان لەگەڵ ئەنێــرم، ئەیناســیت، کــابرایەکی بێــوەیە، ئەوەی کە تــازە لە ســەربازی ناردوویــانەتەوە. هەرسێکیان بەیەکەوە گەنم بار کەن بۆ وێستگەکە، ئیتر کــێ ئەتــوانێ تــوخنی بــووکەکەت بــکەوێ؟ وا نییە؟ تــۆ

ئەڵێــی چــی، ســەییت؟ ئەمــانەوێ جەمــیلە بکەیــن بە عەرەبانچی، کەچی دایکت پێی ناخۆشــە، ئا بزانە ڕازیی ناکەیت!"

وەســفکردنەکەی ئوروزمــات هەڵیــدام، بەڕاســتییش کاتێک پرســی پــێ کــردم؛ خــۆم وەکــوو پیــاوێکی تەواو هـاتە بەر چـاو، لە هەمـان کاتدا هێنـامە بەر چـاوم چەنـد خۆشە لەگەڵ جەمیلە عەرەبانە لێبخوڕم بۆ وێستگەکە!

بە خۆ بە دڵتەنـگ نیشـاندانەوە بە دایکمـم وت: "هیچـی بەســەر نــایەت، خــۆ گــورگ نامــانخوات!" بە قورســی شــانێکم هەڵتەکانــد و وەکــوو عەرەبــانچییەکی کــارامە تفـێکم ڕۆکـرد و قـامچییەکەم بەدوای خۆمـا ڕائەکێشـا وەکوو شتێکی گرنگم درکاندبێت.

"گــوێی لێـی بگــرە!" دایکـم بەسەرســوڕمانەوە تــووڕە بوو. دیار بوو تۆزێکیش پێی خۆش بوو، بەڵام لەپڕ بە دەنگێکی تــووڕەوە لەســەری ڕۆیشــت: "تـۆ چـی ئەزانـی لەسەر گورگ، پیاوە تێکەیشتووەکە!"

"باشــە، کــێ ئەزانێــت ئەگەر ئەم نەبــووایە چــی ڕووی ئەدا! ئەو پیاوی هەردوو خێزانەکەیە، تۆ ئەبێت شانازیی پێوە بکەیت!" ئوروزمات وتی و ئەترسا دایکم دیسانەوە هەڵچێتەوە.

بەڵام دایکم لاریی نەبوو، لەپڕ بێتاقەت دەرکەوت و بە هەناســەیەکی قووڵەوە وتــی: "پیــاوی چــی! هێشــتا منــاڵە،

هەر چەند شەو و ڕۆژیش ئیش ئەکات. خوا خۆی ئەزانێت ژیجیت (djigit - پیاوی ڕاستەقینە)ە خۆشەویستەکانمان لە کوێن وماڵەکانمان ئەوەنە چۆڵە، ئەڵێی هەواری خاڵییە.

ئیتر دوور کەوتبوومەوە، گوێم لە دەنگی دایکم نەمابوو، دوای ئەوە نەمئەزانی چیی ئەوت. قامچییەکم دا لە سیلەی دیوارەکە و تۆزی لێ بەرز بووەوە، بە خۆ بە شت زانینەوە بەرەو دەرگاکە ڕۆیشتم، بێ ئەوەی هەتا وەڵامی زەردەخەنەی خوشکەکەم بدەمەوە.

لە حەوشەکەدا شیاکەی ئەپێژا[11]، تەپەتەپ بە دەستەکانی ئەیکردن بە تەپکە بۆ سووتاندن.

لەناو دەرگاکەدا چیچکەم کرد و لە گۆزەیەک ئاوم کرد بە دەستما و هێواش شۆردم و چوومە ژوورەوە و جامێک دۆم خواردەوە و جامێکی ترم خستە سەر قەراغی پەنجەرەکە و نانم تێ ئەوڵی بیکەم بە تریت.

دایکم و ئوروزمات هێشتا هەر لە حەوشەکەدا بوون، بەڵام ئیتر چەلەحانێیان نەئەکرد، بەڵکوو بەهێمنی ئەدوان، وا دیار بوو باسی براکانمیان ئەکرد، دایکم بەردەوام چاوەکانی بە سەرقۆڵی کراسەکەی ئەسڕی و بە جووڵەی سەری وشەکانی ئەسەپاند، دیار بوو قسەکانی ئوروزمات دڵخۆشییان ئەدایەوە.

دایکم لەسەر پۆپەی چنارەکانەوە بۆ شوێنێکی زۆر دوور ئەیڕوانی، وەکوو بڵێی لەوێ کوڕەکانی ئەبینێ.

دایکم لە خەیاڵەکانیا نوقم بووبوو، دیار بوو سەرئەنجام ڕازی بوو بە پێشنیارەکەی ئوروزمات. ئەویش دڵی خۆش بوو پلانەکەی هاتە دی، قامچییەکی دا لە ئەسپەکەی و بە لۆقە[12] لە ماڵەکە چووە دەرەوە.

پێویست بە وتن ناکات، کەس نەیئەزانی بە هۆی ئەم بابەتەوە چی ڕوو ئەدات، نە من و نە دایکیشم.

هیچ گومانم نەبوو جەمیلە ئەتوانێ عەرەبانە دوو ئەسپییەکەی بڕانێت. ئەو زۆر شارەزای ئەسپسواری بوو، چونکە کچی ڕەوگ[13] بەخێوکەرێکی گوندی باکایری شاخاوی بوو. سادقی ئێمەش هەر ڕەوگەوان بوو، ئەڵێن جارێک ڕۆژێکی بەهار لە پێشبڕکێیەکی ئەسپسواریدا نەیتوانیوە بە جەمیلە بگاتەوە. کەس نازانێ ئەوە ڕاستە یان نا، بەڵام ئەڵێن دوای ئەو ڕووداوە هەستی بە سووکایەتی کردووە و لە داخا هەڵیگرتووە، بەڵام هەندێکی تر ئەڵێن حەزیان لەیەک بووە و بەیەک گەیشتوون.

بەڵام لەوانەیە وا بێت، هەر چەند تەنیا چوار مانگ بەیەکەوە بوون و جەنگ دەستی پێ کرد و سادق گیرا بە سەرباز.

نـازانم هـۆی چیـیه، لەوانەیه به هـۆی ئەوەوه بێـت جەمـــیله هەر له منــــاڵییەوه لەگەڵ باوکیـــا ئەســـپی لەوەڕانـدبێ، چـونکه بـاوکی له کـوڕ و کـچ؛ تەنیـا هەر ئەوی هەبـووه، بەڵام هەنـدێ ڕەفتـاری کـوڕانەی هەیه، تونـده و هەتـا هەندێ جـاریش کەللەڕەق و له ئیشیشـدا هەمیشــه وەکـوو پیـاو بەهەڵـمەت. لەگەڵ ژنـانی تریشـا پەیوەنـــدیی زۆر بـــاش بـــوو، بەڵام ئەگەر به نـــاهەق سـووکایەتیی پـێ بکـرایه، کەس بەقەد ئەو دەمـهەراش نەبـوو، جـاریش هەبـووه له تووڕەییـا دەسـتی داوەته قژیـان و خەڵکیش چەنـدین جـار بـۆ شـکات هـاتوونەته سەرمان: "ئەمه کەی بووکه ئێوه هەتـانه! هـاتووه خۆی داوەته پاڵ ئێوه و زمانی گەزێک درێژه! نه ڕێزی کەس ئەگرێت و نه هیی خۆی!"

"مـــن پـــێم خۆشــــه وایه." دایکـــم وەڵامـــی ئەدایەوه: "بووکەکەمـــــان قســـــەی لەڕووه، ئەم لەوه باشـــــتره له پاشـمله قسـه به کەس بڵێ، کچەکانی ئێوه خۆیان پـاک نیشـان ئەدەن، بەڵام پاکییەکەیـان وەکـوو هـێلکەی پـیس وایه، له دیـوی دەرەوه جـوان و سـپی، بەڵام له نـاوەوه ئەبێت لووتی خۆت بگری له بۆگەنییا."

دایکه بچـووکەکەم و بـاوکم مامەڵەیـان خـراپ نەبـوو لەگەڵ جەمـیله وەک له خەسـوو و خەزوور چـاوەڕوان ئەکرێت، باش بوون لەگەڵی و خۆشیان ئەویست و تاکه ئاواتیان ئەوه بوو دڵسۆز بێت بۆ الله[١٤] و مێردەکەی.

لێیـان تێئەگەیشـتم، کە چـوار کوڕیـان لە بەرەکـانی جەنـگ بـوون، دڵیان بە جەمیلەی تـاکە بـووکی هەردوو ماڵەکەیان ئەکرایەوە و بۆنی کوڕەکانیان نـابوو بەوەوە، بەڵام سـەرم لە دایکـم دەرنەئەکـرد، ئەو لەوانە نەبـوو کەسـی بەئاسـانی خـۆش بوێـت. دایکـم هەر بەسروشـتی دڵڕەق و خۆسـەپێن بـوو، بەپێی ئەو یاسـایانە ئەژیـا کە خۆی دایتابوون و هەرگیز ئامادە نەبوو بیانگۆڕێت. بۆ نمـوونە؛ هەمـوو سـاڵێک کە بەهـار ئەهـات، دەوارە کـۆنەکەی خۆمـانی لە حەوشـەکەدا هەڵـئەدا کە بـاوکم بەگەنجـی دروسـتی کردبـوو و چـیلکەی درەختـی "سەروو"[15]ی لە ژێرا ئەسووتاند بۆ بۆنخۆشی. ئێمەی وا پەروەردە کردبوو ئیشـکەر بین و ڕێزی لە خۆمـان گەورەتـر بگـرین و هـیچ کـام لە ئەنـدامانی خێـزان لە قسەی دەرنەچین.

هەر لە سەرەتاوە کە جەمیلە هـات، ئەو بـووکە نەبوو کە چاوەڕوان ئەکرا وا بووایە. زۆر ڕاسـتە کە ڕێزی لە گەورەکـانی ئەگـرت و بەقسـەی ئەکـردن، بەڵام هەرگیـز سـەری بـۆ دانەئەنەوانـدن، بەرامـبەر ئەوەش بـۆڵەیەکی نەئەکرد و پشـتیان تـێ هەڵبکـات وەکـوو تازەبووکەکـان، بەبـێ تـرس چـی لە دڵیـا بـووایە دەریئەبـڕی و نەیئەشاردەوە.

دایکم عادەتەن پشتگیریی ئەکرد و ڕای لەگەڵیا بوو، بەڵام هەمیشە ئەو مافەی بە خۆی ئەدا کە بڕیاری کۆتایی بەدەست ئەو بێت.

بڕوام وا بوو دایکم لەو قسەلەڕوویی و چاونەترسییەی جەمیلەدا خۆی ئەبینییەوە، لە ناخی خۆیدا ئاواتی ئەخواست ڕۆژێک جێی ئەم بگرێتەوە و وای لێ بکات ئافرەتێکی بەهێز و بابیچە -پارێزەری تەبایی ماڵەکە- بێت، وەکوو خۆی.

"شوکری اللە بکە کچەکەم، چارەنووست کەوتۆتە ماڵێکی ئاوا دامەزراو و پیرۆز." دایکم بەردەوام دووبارەی ئەکردەوە: "تۆ بەختت هەیە، کامەرانیی ژن لەوەدایە منال پەروەردە بکات و لە ماڵێکی قەرەباڵغدا بژی. لە اللە بە زیاد بێ هەموو ئەوەی ئێمە تا ئەم تەمەنە کۆمان کردۆتەوە، بۆ تۆ ئەبێت. تۆ ئەزانی لەگەڵ خۆمان نایبەین، بەڵام سوودوەرگرتن لەو هەمووە بەوە ئەبێت شەرەفی خۆت بپارێزیت و ویژدانت هەبێ. ئەمانەت لەبیر بێ و ئاگات لە خۆت بێت!"

هەندێ شت هەبوو دەربارەی جەمیلە؛ هەردوو خەسووەکەی بێتاقەت کردبوو، زۆر ڕووخۆش بوو وەکوو ئەوەی هێشتا منال بێت، لەپڕ ئەیدایە قاقای پێکەنین و بە دەنگی بەرزیش بەبێ هۆکار. کاتێک لە ئیش ئەگەڕایەوە، لەجیاتیی ئەوەی لەسەرخۆ بڕوات؛ بەڕاکردن خۆی ئەکرد بە حەوشەکەدا و بەسەر

جـــۆگەکەدا بـــازی ئەدا و دەســـتی ئەکـــردە ملـــی خەسـوویەکیان، دەسـتی ئەکـرد بە مـاچکردنی و دوای ئەویش خەسووەکەی تری.

جەمــیلە حەزی لە گــۆرانییش بــوو، هەمیشــە لەبەر خۆیەوە ورەوری بوو، بێ ئەوەی شـەرم لە گەورەکـان بکـات. بەئاشـــکرا بڵێـین ئەم ڕەفتـارانە پـێچەوانەی دابونەریتی لادێییانەی ئێمە بوو بۆ هەڵسوکەوتی بووک، بەڵام هەردوو خەســـووەکە دڵخۆشـــی خۆیـــان بەوە ئەدایەوە جەمیلە وردە وردە چاک ئەبێت. ئەوانیش هەر وا نەبوون کە وەک ئەو گەنج بوون؟ بەڵام بەلای منەوە هیچ کەس لە دنیادا لە جەمیلە باشتر نییە، کە بەیەکەوە ئەبــووین؛ گەمەمــان ئەکــرد و یەکتریمــان ڕاو ئەنــا لە حەوشەکەدا و پێئەکەنیین و پێئەکەنیین.

جەمـیلە زۆر جـوان بـوو، بـاڵایەکی ڕێکوپێـک و پڕی هەبوو، قژەکەی کردبوو بە دوو پەلکەی درێژی زبـر و قورس، دەسرێکی سـپیی تۆزێـک بەخـواری بەسـتبوو بە نـاوچەوانیەوە و ئەم شـێوەیەی زۆر لێئەهـات و پێسـتە ئەسـمەرە ناسـکەکەی دەموچاوی جوانتر ئەنواند.کاتێک پێئەکەنـــی؛ ســــۆمای چـــاوە بـــادەمییە ڕەشــــە مەیلەوشـینەکانی ئەبریسـکانەوە و کاتێـک لەپـڕ دەسـتی ئەکرد بە بەسـتەیەکی دڵتەنگی لادێ؛ دڵتەنگیی بە چـاوە جوانەکانیەوە دەرئەکەوت.

زۆر جار تێبینیم ئەکرد ژیجیتە لاوەکان، بەتایبەتی ئەو سەربازانەی لە بەرەکانەوە ئەهاتنەوە، چاویان تێ ئەبڕی. جەمیلە هەمیشە حەزی لە شۆخی بوو، بەڵام دەستبەجێ بەرپەرچی ئەو کەسەی ئەدایەوە نیازی خراپ بێت، لەگەڵ ئەوەشدا من هەمیشە بەوە بێتاقەت ئەبووم، غیرەت ئەیگرتم وەک چۆن برا بچووکەکان ئەیانەوێ بەرگری لە خوشکەکانیان بکەن. کاتێک ئەمبینی گەنجێک دەوروخولی جەمیلە ئەدا، ئەمویست بە هەر جۆرێک بێت خۆم تێهەڵقورتێنم، لە بەردەمیا ئەوەستام و بە چاوی قینەوە سەیرم ئەکرد وەکوو پێی بڵێم: "ها! ئاگات لە خۆت بێ، ئەوە براژنمە، وا مەزانە بێکەسە!"

لە کاتی وادا بە جۆرێکی نەشیاو ئەدوام بۆ سووککردنی ئەوانەی دەوریان ئەدا، کە کەس حسابی بۆ نەئەکردم؛ خۆم گێف ئەکرد و ئەمڕاند، گەنجەکانیش ئەیاندایە قاقای پێکەنین:

"تۆ سەیری کەن! ئەمە براژنی ئەمە بێت، مانای ئەوەیە هیچ! بۆچی ئێمە حسابی ئەمەمان نەکردووە!"

هەوڵم ئەدا دان بەخۆما بگرم، بەڵام هەستم ئەکرد گوێچکەکانم سوور هەڵئەگەڕان، فرمێسک ئەزانە چاوم کە سووکایەتییان پێ ئەکردم. بەڵام جەمیلەی براژنم هەستی پێ ئەکردم، پێکەنینەکەی خۆی ئەشاردەوە و خۆی پەرۆش نیشان ئەدا و بێشەرمانە بە گەنجەکانی

ئەوت: "بۆ وا ئەزانن براژنەکان بەرەلان؟ لەوانەیە لای ئێوە وا بن، بەلام لێرە نا! وەرە کیچنی بالا، ئەوانە چین!"

دوای ئەوە سەرکولمەکانی لە شەرما سوور هەلئەگەڕان و بەشکۆوە سەری هەلئەبڕی و شانێکی بە هیچ نەزانینی گەنجەکانی هەلئەتەکاند و زەردەخەنەیەکی بۆ خۆی ئەکرد و بەیەکەوە ئەڕۆیشتین.

لەو زەردەخەنەیەدا هەم خۆشی و هەم ناخۆشیی بۆ من تیا بوو، لەوانە بوو لە دلی خۆیدا ئەیوت: "کەرە! من ئەگەر بمەوێت خۆم بدەم بەدەستەوە، کەس ئەتوانێ ڕێگریم لێ بکات؟ ئەگەر هەموو خێزانەکەش چاودێریم بکات، من ئەتوانم ئیشی خۆم بکەم." لە حالەتی وادا هەستم بە تاوانباری ئەکرد و بێدەنگ ئەبووم، بەلێ، غیرەم لە جەمیلە ئەکرد، ئەمپەرست، شانازیم ئەکرد براژنمە، شانازیم بە جوانی و سەربەخۆیی و سروشتە سەرکێشەکەی ئەکرد، ئێمە باشترین هاوڕێ بووین و هیچمان لەیەک نەئەشاردەوە.

لەو کاتی جەنگەدا پیاوان کەم لە ئاواییدا مابوون، هەندێ لە گەنجان ئەمەیان بە دەرفەت ئەزانی و هەلسوکەوتی ناشرینیان ئەکرد و بێشەرمانە مامەلەیان لەگەل ژنان ئەکرد، وەکوو لە دلی خۆیانا بلێن: "پێویست ناکات خۆتیان لەگەلا ماندوو بکەیت، کێت بەدلە؛ بە پەنجەیەک ئیشارەتی بۆ بکە، بەڕاکردن دوات ئەکەوێ."

ڕۆژێکی کڵۆش[17] کێشان، ئوسمان[18] که خزمێکی دوورمان بوو، نیازی خراپ بوو بەرامبەر جەمیلە، یەکێک بوو لەو کەسانەی هەستی ئەکرد هیچ ئافرەتێک ناتوانێ لە ڕوویا بوەستێ، بەڵام جەمیلە بەتوورەییەوە پاڵی نا بە دەستیەوە و هەستایە سەر پێ، کاتێک لە سێبەری شارایەکا دانیشتبوو؛ ئیسراحەتی ئەکرد.

"بڕۆ لا چۆ!" بەبێزارییەوە پێی وت و ڕۆیشت: "نێرەکەری وەک تۆ، هەر ئەوەی لێ چاوەڕوان ئەکرێت."

ئوسمان بەشێواوی لەسەر کڵۆشەکە ڕاکشا و لێوە تەڕەکانی ئەگەست و بەری ئەدان: "پشیلە دەمی نەئەگەیشتە گۆشتە بەرز هەڵواسراوەکە، ئەیوت بۆگەنە[19]. من ئەزانم خەریکە سوێت ئەبێتەوە بۆی، ئیتر بۆ ئەوەندە لووتبەرزی و خۆت بە شت ئەزانی."

جەمیلە پێچێکی لێدا: "لەوانەیە منیش ئارەزووم هەبێت! بەڵام ئەوە چارەنووسمانە، تۆ بێعەقڵی ئەگەر وا بزانیت هیچ شتێک باشتر نییە لەوەی تەنیا پێبکەنیت. من سەد ساڵ ژنێکی دوورەمێردی سەربازێک بم، بەڵام شتی وەک تۆ؛ چڵمیشی پیا ناسرم! بێزم لێت دێتەوە! ئەگەر ئەم جەنگە نەبووایە، تۆ کەس هەر سەیریشی نەئەکردیت!"

"منیش وا ئەڵێم! ئەگەر جەنگ نەبووایە، تۆش بەبێ قامچیی مێرد؛ ئاوا ئاگرت نەئەگرت!" زەردەخەنەیەکی ناچاریی کرد: "ئاخ! خۆزگە ژنی من ئەبوویت، ئەمزانی چۆن تەمێم ئەکردی."

جەمیلە خەریک بوو ئامبازی بێت، بەڵام هیچی نەوت، ئەیزانی شایانی ئەوە نییە بچێت بەگژیا، ڕوانینەکەی پڕ بوو لە قین. تفێکی ناشیرینی کرد و شەنەکەی هەڵگرت و دوور کەوتەوە.

من بەسەر عەرەبانەکەوە بووم لەپشت خەرمانەکەوە، کە جەمیلە منی بینی؛ پشتی تێ کردم، تێگەیشت لە چی حاڵێکدام. وا هەستم ئەکرد منم نەک ئەو کە سووکایەتیی پێ کراوە، من کەرامەتم شکاوە، بەدڵشکاوییەوە لۆمەم کرد: "بۆ تێکەڵی ئەم جۆرە کەسانە ئەبیت؟ چۆن بێزت دێ قسەیان لەگەڵ ئەکەیت؟"

جەمیلە ئەو ڕۆژە تا ئێوارە وەکوو هەور ڕەش هەڵگەڕابوو، بێ ئەوەی وشەیەک بڵێ یان وەکوو جاران بۆم پێبکەنێ. کە عەرەبانەکەم لێ نزیک کردەوە؛ بەتوندی شەنەکەی چەقانە مەڵۆکە و بە یەک جار بەرزی کردەوە و بە جۆرێک هەڵیگرت کە دەموچاوی دیار نەبێت، بۆ ئەوەی بوارم نەبێت قسەی لەگەڵ بکەم دەربارەی ئەو سووکایەتییەی گرتبوویە دڵ.

ئەو مەلۆیەی فڕێ ئەدایە عەرەبانەکە و خێرا ڕایئەکرد بۆ مەلۆیەکی تر، زۆری نەبرد عەرەبانەکە پڕ بوو. کە دوور کەوتــمەوە؛ ئـاوڕێکم دایەوە بینــیم وەســتاوە و سەری داخستووە و خۆی داوە بەسەر کلکی شەنەکەدا و بیر لە شتێک ئەکاتەوە، لەپڕ بیرکردنەوەی پچڕی و دەستی کردەوە بە ئیشکردن.

کە دوایین عەرەبانەمـان پڕ کـرد؛ جەمیلە مـاوەیەکی باش ڕووی کردە ئاسـۆی خۆرئـاوا، هەمـوو شـتێکی لە دنیادا لەبیر چوو؛ ئەوە نەبێ، لەوێ لەوبەر چەمەوە، لە جێیەک لە دوایین هێڵـی دەشـتی کازاخسـتان؛ خـۆری لاوازی ڕۆژگـاری درویـنە وەکـوو دەمـی تەنـوورێکی (تەنـدیر - tandyr) داخـراو ئەگـڕا. لەسـەرخۆ نـوقمی ئاسۆ ئەبوو، ڕەنگی هەورە تەنکەکانی قرمزی ئەکرد و دوایین تیشکەکانی بەسـەر دەشـتە پەمەییەکەدا پەخش ئەکرد، کە لە بەرەبەیانـدا دۆڵەکانی بە سـێبەرێک شـین کردبوو.

جەمیلە سـەیری خۆرئاوابوونی ئەکرد، دڵی زۆر پێی خـۆش بـوو، وەکـوو شـاهیدی ڕوودانـی مـوعجیزەیەک بێـت، دەموچـاوی لە خۆشـییا گەشـابووەوە، لێوەکـانی وەکوو لێوی منداڵ بە زەردەخەنەیەک لەیەک ترازابوون. دوایــی وەکــوو وەڵامــی ئەو لۆمانەمــان بــداتەوە کە نەموتـووە و لەسـەر زمـانمن، ڕووی تـێ کـردم و وتـی: "گــوێی مەدەرێ شــووبرا، بیــری لــێ مەکەرەوە! ئەو

کـابرایە بـایی ئەوە نیـیە." جەمـیلە بێـدەنگ بـووەوە، سەیری کەنارە سوورەکانی ڕۆژی ئەکرد، هەناسەیەکی هەڵکێشـا و وتـی: "کەسـانی وەکـوو ئوسـمان چـووزانن چـی لە نـاخی بەرامبەرەکەیانـدایە، کەس لە نـاخی کەس تێناگـات... لەوانەیە پیـاوی لەو جـۆرە هەر لە دنیـادا نەبێت."

کاتێک من ئەسپەکانم ئەگێڕایەوە؛ جەمیلە ڕایکرد بۆ نـاو کۆمەڵی ژن، گوێم لە دەنگیـان بوو، بە ئاوازەکەیـا دیـار بـوو دڵیـان خۆشـە. نـاتوانی تێبگەیـت چـۆن ئەو گـۆڕانەی بەسـەرا هـات... لەوانەیە بەو سـەیرکردنەی خۆرئـاوابوون بەری دابێـت، یـان لەوانەیە بە هـۆی کـامەرانییەوە بێـت کە ڕۆژێکـی تەواو ئیشـی کـردووە. لەسەر بارە کڵۆشەکە دانیشتم سەیری جەمیلەم ئەکرد، لەچکە سپییەکەی لە سەری کردەوە و بەناو پەرێزەکەدا بەدوای کچێکی هاوڕێیدا ڕایئەکرد، باوەشی کردبووەوە و بـا دامێنـی کراسـەکەی ئەشـەکاندەوە، منـیش لەپـڕ خەفەت لە دڵما نەما. "بۆچی بیر لە بێعەقڵیی ئوسـمان بکەمەوە!" خوڕیم لە ئەسپەکان و قامچییەکەم لێدان و هاوارم کرد: "دەرچۆ! (گیدییاپ)"

ئەو ڕۆژە وەکـوو سـەرۆکتیم ئامۆژگـاریی کـردم، چـاوەڕێی بـاوکمم کرد بێتەوە سـەرم بتاشـێت، هەمـان کاتیش دانیشتم وەڵامی نامەیەکی سادقی برام بدەمەوە. هەتـا لە نـامە نووسینیشـا یاسـای نەنووسـراو هەبـوو:

براکەم نامەکانی ئاراستەی باوکم ئەکرد، پۆستەچییەکەی ئاوایی ئەیدایە دەست دایکم، ئەبووایە منیش بیخوێنمەوە و وەڵامیان بدەمەوە. تەنانەت پێش کردنەوەی نامەکەش، ئەمزانی سادق چیی نووسیوە. نامەکانی ئەوەندە لەیەک ئەچوون، وەکوو کۆمەڵێک بەرخ بن بەیەکەوە.

سادق هەمیشە نامەکەی بەوە دەست پێ ئەکرد هیوای سەلامەتیی بۆ هەموو لایەک ئەخواست و بەردەوام ئەبوو: "ئەم نامەیە بە پۆستەدا ئەنێرم بۆ کەسوکارم لە 'تالاس'ی بۆنخۆشی پڕ گوڵ و گوڵزار. بۆ باوکی زۆر خۆشەویست و بەڕێزم ژوڵچوبای..."

ئینجا ئەهاتە سەر دایکم، دایکی خۆی و بەسەرە یەکە یەکە ئەوانی تر. ئینجا ئەبێ پرسیاری تەندروستی و لەشساغیی هەموو ئەکساکاڵ (ڕیشسپی)ەکانی هۆزەکەمان و خزمە نزیکەکانمان بپرسێت، تەنیا لە کۆتاییشدا، وەکوو پەلەی بێت، سادق ئەینووسی: "سەلام لە جەمیلەی خێزانیشم ئەکەم".

ئاسایی مادام دایک و باوکم لە ژیانا ماون و ئەبێ سڵاو بنێرێ بۆ ڕیشسپییەکانی عەشرەت و کەسوکارمان لە ئاوایی، ناوبردنی ژن لە سەرەتاوە یان ناردنی نامە بە ناوی ئەوەوە؛ هەرگیز ڕێپێدراو نییە. نەک هەر تەنیا سادق، بەڵکوو هەر کەسێک خۆی بە پیاو بزانێت هەمان بیروڕای هەبوو. ئەمە جێی پرسیار

نەبوو، نەریتێکی چەسپاو بوو، نەئەبوو دەستکاری بکرایە، ئێمە هەر بیریشمان لەوە نەکردۆتەوە ئایا ڕاستە یان هەڵەیە، هەر چۆنێک بێت نامەیەک زۆر چاوەڕوانی ئەکرا و خۆشیی ئەخستە ناو ماڵ.

دایکم ناچاری ئەکردم چەند جارێک نامەکە بخوێنمەوە، ئینجا پارچە کاغەزەکەی بە دڵسۆزی و پیرۆزییەوە ئەگرت بە دەستە ماندووەکانیەوە، وەکوو چۆلەکەیەکی گرتبێ خەریک بێ بفڕێ، ئینجا بە پەنجە زبرەکانی ئەینووشتاندەوە و ئەیکرد بە سێگۆشە.

"ئای خۆشەویستەکانم، نامەکانتان وەکوو نوشتە هەڵئەگرین!" بە دەنگێکی لەرزۆک و بەفرمێسکەوە ئەیوت: "ئەڵێ دایک و باوکم و خزمان چۆنن. ئێمە چیمان لێ یەت؟ ئەوەتاین لە ماڵی خۆمانا، لە ئاوایی خۆمانا، بەڵام تۆ لەوێ چۆنیت؟ تەنیا یەک وشەمان بۆ بنووسە و بڵێ ماوم، ئەوەنەمان بەسە، لەوە زیاترمان ناوێ."

دایکم تێر سەیری نوشتەکەی دەستی ئەکرد و ئەیخستە جزدانە چەرمەکەی لای نامەکانی تر و ئەیخستە باوەڵەکە و دایئەخست.

ئەگەر لەو کاتەدا جەمیلەش لە ماڵ بووایە، ئەیانهێشت ئەویش بیخوێنێتەوە. تێبینیم کردبوو کاتێک نوشتەکەی ئەگرت بە دەستەوە؛ کولمەکانی سوور هەڵئەگەڕان و

بەتامەزرۆییەوە لە دڵی خۆیدا ئەیخوێندەوە و بەخێرایی بەسەر دێڕەکاندا ئەهات و ئەچوو، کە لە کۆتایی نزیک ئەبووەوە؛ شانەکانی دائەتەکاند و ئاگری کوڵمەکانی وردە وردە ئەکوژانەوە، برۆکانی ئەهێنایەوە یەک و دوا دێڕەکانی نەئەخوێندەوە و بێبایەخ و بەساردەوە ئەیدایەوە دەست دایکم وەکوو بەئەمانەت لێی وەرگرتبێت.

دیارە دایکم بە ڕێگای تایبەتیی خۆی مەزاجی بووکەکەی ئەزانی، بۆیە هانی ئەدا و دڵی خۆش ئەکرد. لە کاتێکدا باوەڵەکەی دائەخست، وتی: "ئەوە چیتە؟ لەجیاتیی ئەوەی دڵت خۆش بێت، غەمبار دیاریت! تۆ وا ئەزانی هەر مێردەکەی تۆ بەتەنیا گیراوە بە سەربازی؟ تۆ تەنیا کەس نیت کێشەت هەبێ، هەموو نەتەوە خوێنی لێ ئەچۆڕێ، تۆش لەگەڵ خەڵکا ئارام بگرە. تۆ وا ئەزانی ئافرەتی تر نییە بەتەنیا بێت و بیری مێردەکەی بکات! خەفەت بخۆ و بیری بکە، بەڵام دەریمەبڕە، با لە دڵی خۆتا بێت."

جەمیلە هیچی نەوت، بەڵام ڕوانینە توندەکەی وەکوو ئەوە وا بوو بڵێت: "ئۆە دایکە، تۆ هیچ نازانی!"

ئەم جارەش وەک پێشوو نامەکەی سادق لە "ساراتۆف"ەوە هاتبوو کە لەوێ لە خەستەخانە کەوتبوو، سادق نووسیبووی خوا پشتیوانی بێت ئەم پاییزە لە ماڵەوە ئەبێت، جاری تریش ئەمەی نووسیبوو،

ئـێمە هەموومــان بەخۆشــییەوە پەلەی ئەوەمــان بــوو بێتەوە ناومان.

لە کۆتاییدا من ئەو ڕۆژە لە ماڵەوە نەمامەوە، چووم بۆ سەر خەرمانەکە کە بەزۆری شەو لەوێ ئەخەوتم. ئەسپەکانم برد بۆ ناو سێپەڕەکە و بەستمنەوە. بەرپرسی گێڵگە هەرەوەزییەکە نایەڵێت ئاژەڵ بکەینە ناو سێپەڕەکەوە، بەڵام من سەرپێچیم کرد، چونکە ویستم ئەسپەکانم تێر بن. شوێنێکی چەپەکم ئەزانی لە شیوەکەدا کە کەس بە شەو هەستی بە هیچ نەئەکرد تیایدا. ئەم جارە کە جلەکانم لە ئەسپەکان کردەوە و ڕامکێشان بۆ ناو گیابەندەکە؛ بینیم کەسێکی تر پێش من چوار ئەسپی بردووە کردوویەتیە ناو سێپەڕەکە، ئەوە پەستی کردم، چونکە من خاوەنی عەرەبانەیەکی دوو ئەسپی بووم، ئەمەش مافی ئەوەی ئەدامێ پەست بم، بۆیە بێ دوودڵی ئەسپەکانم دەرکرد بۆ ئەوەی دەرسێکی ئەو بێئابڕووە دابدەم کە سنوورەکەی منی بەزاندووە. لەپڕ دووان لە ئەسپەکانی دانیارم ناسییەوە، ئەو برادەرەی ئەو ڕۆژە سەرۆکتیم باسی کرد، کە زانیم هیی ئەوە و سبەینێ بەیانی بەیەکەوە ئیش ئەکەین؛ وازم لێ هێنان و گەڕامەوە بۆ سەر خەرمانەکە.

دانیـارم لەوێ بینـی، تـازە پێچکەکـانی عەرەبـانەکەی چەور کردبوو و خەریکی توندکردنەوەی برغووەکانی بوو.

"دانیـار ئەو ئەسـپانە هیـی تـۆ بـوون لە شـیوەکەدا؟" بەهێواشی سەری هەڵبڕی.

"دووانیان، ئا!"

"ئەی دووانەکەی تر؟"

"دووانەکەی تـر هیـی هیـنە... چیـی نـاوە... وا بـزانم جەمیلە... ئەسپی ئەون. چیتە؟ وا بزانم براژنتە؟"

"بەڵێ، براژنمە."

"سـەرۆکی تـیم خـۆی کـردنیە ئەوێ و بە منـی وت چاوم لێیان بێت."

"باش بوو دەرمنەکردن!"

شەو هات، شەماڵەکەی ئێوارە لە شاخەکانەوە ئەهات؛ بێدەنگ بـوو، لەسـەر جێ خەرمـانەکەش هەمـوو شـتێک بێدەنگ بوو، دانیاریش لەپاڵ منا لەژێر شارایەک کڵۆشـا پاڵ کەوت، بەڵام پاش تۆزێک هەستا و بەرەو چەمەکە ڕۆیشت.

لەسـەر کەنـارە بەرزەکە وەسـتا و تاوێـک مـایەوە، پشـتی لە مـن بـوو، دەسـتەکانی لە دواوە و سـەری بەئاسـتەم بە لایەکـا خـوار بـوو، بـالا کەڵەگەتە

گۆشـــەدارەکەی لەبەر تیشـــکی کـــاڵی مانگەشـــەوەکە ئەجـــوولآیەوە وەکـــوو بە تەور لێـــی درابێـــت، تـــومەز بەوریاییەوە گوێی لە هاژەی چەمە خوڕەکە گرتووە کە لە تاشەکانەوە ئەهاتە خوارەوە، چونکە بە شـەو ئاشکرا و بەرزتـر ئەبیسـترا. لەوانەیە گـوێی لە چپە و دەنگێـک گرتبێ کە مـن نایبیسـتم، "گـرەو ئەکەم جارێکی تـریش بڕیـاری داوە شـەو لە گوێچەمەکە بێـت"، لە دڵـی خۆمـا وتم و هەر وا پێکەنیم.

دانیـار تـازە هـاتبووە ئاوایـیەکەمـان، ڕۆژێـک منالێـک بەڕاکـردن هـات بـۆ سـەر پەرێـزەکە و هـاواری ئەکـرد سەربازێکی زامار[٢٠] هاتۆتە ئاوایی، ئیتر نەیئەزانی کێیە و خەڵکی کوێیە. ئەو هەرایەی ئەم هەواڵە نایەوە، کاتێک یەکێک لە بەرەکانی جەنگ ئەگەڕێتەوە؛ هەموو خەڵک بە گەورە و بچـووکەوە دەسـتە دەسـتە بەڕاکـردن ئەگەنە لای بـــۆ ئەوەی بیبیـــنن، تەوقەی لەگەڵ بـــکەن و لێـــی بپرسـن بـزانن خزمەکـانی ئەوانـی نەدیـوە و بـۆ ئەوەی دوایـین هەواڵ ببیسـتن، شـڵەژانی ئەم جـارە وا نەبـوو، هەر کەسـێک وا بەتەمـا بـوو لەوانەیە بـراکەی ئەو بێـت هـاتۆتەوە، یـان لەوانەیە ژنبـراکەی یـان زاواکەی بێـت! هەتـا ئەوانەی دروێنەشـیان ئەکـرد، ڕایـانکرد بـۆ ئـاوایی بزانن ئەو پیاوە کێیە.

دوایی بۆمان دەرکەوت دانیار لە بنچینەدا خەڵکی لای ئێمەیە، ئەڵێن منالێکی هەتیو بووە، سێ ساڵ لێرە بووە

و ماڵەومـــاڵ گەڕاوە و بەخێویـــان کـــردووە، دواتـــر ڕۆیشتووە لە دەشتی "چەکمەک" لای کازاخەکان بژی، چونکە خزمەکانی لە دایکیەوە کازاخی بوون، گەنجەکە هیچ خزمێکی نزیکی لای ئێمە نەبوو بیگرنە خۆیان، ئیتر لەبیر چووەوە.

کە لێیـــان ئەپرســـی دوای ئەوەی ئێـــرەی بەجـــێ هێشـتووە چـۆن ژیـاوە، دانیـار خـۆی لە پرسـیارەکە ئەدزییەوە و وەڵامی جێی گومانی ئەدایەوە، بەڵام دیار بـوو نەهـامەتیی زۆری بەسـەر هـاتبوو، پێکـی تـاڵی هەتیویی زۆری هەڵدابوو.

ژیـان وەکـوو تاوێرێـک گل بێتەوە؛ کەوتبـووە دوای، مـاوەیەکی زۆر شـوانی مەڕ بـووە لە دەشـتە خـاک سـوێرەکەی چەکـمەک، کە تەمەنـی هەڵکشـاوە بـووە بە کرێکـاری جـۆگە ڕاکێشـان لە بیابانـدا و دواتـر لە کێڵگە هەرەوەزیـیە تازەکـانی پەمـوو و دواتـریش لە کـانە خەڵووزەکـانی "ئەنگـرین" نزیـک تەشـقەنت و لەوێشـەوە برا بۆ سەربازی.

هەڵوێسـتی خەڵـک بەرامـبەر گەڕانەوەی دانیـار بـۆ ئاواییەکەی خۆی؛ باش بوو، ئەیانوت: "کێشـە نییە چەند دەربەدەر بــــووە و غەریبــــی گەڕاوە، ســــەرئەنجام هـاتۆتەوە، ئەمەش مانـای ئەوەیە چارەنووسـی وایە لە ئاوی شـوێنی لەدایکبـوونی بخـواتەوە. زمـانی زگمـاکیی

خۆی لەبیر نەچووبووەوە و بەباشی قسەی پێ ئەکرد، بەڵام زۆر جار وشەی کازاخیی بەکار ئەهێنا."

"تولپار[٢١] لەوپەڕی دنیا بێت، ڕەوگەکەی خۆی ئەدۆزێتەوە. خاکی خۆی و کەسوکارەکەی هەمیشە نزیکترینن لە دڵیەوە.کارێکی باشە گەڕایتەوە. ئێمە خۆشحاڵین، هەروەها ڕۆحی باوباپیرانیشت شادە. پشت بە ئەڵڵا، ئەڵمانەکان ئەبەزێنین و ئاشتی و ئارامی ئەگەڕێتەوە، وەکوو هەر کەسێکی تر ئەبیت بە خاوەنی ماڵ و منداڵی خۆت و تۆش دووکەڵ لە کوانووت بەرز ئەبێتەوە!" ئەکساکاڵە پیرەکە پێی وت.

لە گەڕان بەدوای ڕەچەڵەکیدا، ئەسڵ و فەسڵیان دۆزییەوە. بەو جۆرە (خزمێکی تازە) دانیار لە ئاواییدا دەرکەوت.

دواتر ئورورزمات سەربازە کەڵەگەتە شانخوارە شەلەکەی هێنا بۆ پەرێزەکە، بە پاڵتۆ زلەکەیەوە کە دابووی بە شانیا؛ خێرا ئەڕۆیشت بۆ ئەوەی لە هەنگاوە وردەکانی ئورورزمات دوا نەکەوێت.

بەتەنیشت دانیاری باڵابەرزەوە؛ سەرۆکتیمە کورتەباڵا بزێوەکەمان ئەڕۆیشت، کە شێوەی ماسیگرەی چەمی ئەهێنایە بەر چاومان. کوڕگەل پێکەنینیان ئەهات کە بەتەنیشت یەکەوە ئەڕۆیشتن.

زامەکەی دانیار هێشتا سارێژ نەبووبوو، قاچی هێشتا نەئەنووشتایەوە، مانای ئەوەیە ناتوانێ درەو بکات، ناردبوویانە لای ئێمە لەگەڵ کوڕگەل لەسەر کۆمباینەکان بێت.

بەڕاستی ئێمە خۆشمان نەئەویست، پێش هەموو شتێک ڕقمان لە گۆشەگیرییەکەی بوو. دانیار بەحاڵ قسەی ئەکرد، ئەگەر قسەشی بکردایە؛ وا دیار بوو بیر لە شتێکی تر ئەکاتەوە کە هیچ پەیوەندییەکی بەو بابەتەوە نییە باسی ئەکات، خۆی ئەدایە دەست بیرکردنەوەکانی خۆی. نەتئەزانی تۆ ئەبینێت یان نا، لە کاتێکدا بە چاوە بیرکەرەوە و خەوبینەکانی سوور تەماشای تۆی ئەکرد.

"بەستەزمان، وا دیارە دوای پێکانی لە جەنگا؛ هێشتا نەهاتۆتەوە سەر خۆی!" پێیان ئەوت.

لە هەمووی سەیرتر، لەگەڵ ئەو بیر ڕۆیشتنە بەردەوامەیدا، دانیار زۆر خێرا و بەوردی ئیشی ئەکرد. لە یەکەم بەرکەوتنتدا وات هەست ئەکرد کەسێکی کۆمەڵایەتی و قسەلەڕووە، لەوانەیە مناڵییە نائارامەکەی وای لێ کردبێت بیرکردنەوە و هەستەکانی دەرنەبڕێت و کەسێکی گۆشەگیری لێ دەربچێت. دوور نییە وا بێت!

لێوە تەنکەکانی دانیار لەگەڵ دوو چرچە دیارەکان لە هەردوو گۆشەکانیەوە هەمیشە نووقابوون، چاوەکانی

خەمناک و دڵتەنگ، تەنیا جووڵە خێراکانی برۆکانی ژیانی ئەبەخشییە ئەو ڕواڵەتە ماندووە.

هەندێ جار لەپڕ گوێی هەڵئەخست وەکوو گوێی لە شتێک بێت کە ئێمە گوێمان لێی نییە، لەو کاتەدا برۆکانی بەرز ئەبوونەوە، چاوەکانی بە خۆشییەکی نادیار ئەبریسانەوە، دوای ئەوە زەردەخەنەیەکی کامەرانی بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر دەموچاوی ئەمایەوە، ئێمە هەموومان ئەمەمان بەلاوە سەیر بوو. هەر ئەوەش نا، شتی سەیری تریشی هەبوو. ئێواران کە ئێمە جلەکانمان لە ئەسپەکانمان ئەکردەوە و لە خێوەتێکدا کۆ ئەبووینەوە چاوەڕێی چێشتلێنەرەکە ئەبووین خواردنمان بۆ ئامادە بکات، بەڵام دانیار سەر ئەکەوتە سەر خاڵی پاسەوانییەکە لەسەر گردەکە و تا تاریکی نەکردایە؛ نەئەهاتە خوارەوە. بەپێکەنینەوە ئەمانوت: "ئەوە چی ئەکات لەوێ، دیارە پاسەوانیی شتێک ئەکات."

جارێک هەر بۆ تێرکردنی بزێویی خۆم؛ بەدوایا سەر کەوتم بۆ خاڵی پاسەوانییەکە، هیچ شتێک نائاسایی نەبوو، دەشتە ئەرخەوانییەکە تێکەڵی ئاسۆی دووری زنجیرە شاخەکان بووبوو، کێڵگە ڕەشە تاریکەکان وا دیار بوون لەسەرخۆ لە خامۆشیدا ئەتوانەوە.

دانیار گوێی نەدایە من، دەستەوئەژنۆدانیشتبوو، بە خەیاڵەوە ئەیڕوانییە دوور، دیسانەوە هەستم کرد گوێ

لە دەنگێک ئەگرێت من نایبیستم. ئێستا و جارانیش ئەبوو بە بەرد و چاوەکانی ئەکرانەوە. شتێک بێتاقەتی ئەکرد، ئەمزانی ئێستا هەر چی لە دڵیایەتی هەڵیئەڕێژێت، بۆ من نا، چونکە هەر هەستی پێ نەکردبووم... بۆ شتێکی مەزن، فراوان و ناڕوون بۆ من. بەڵام کاتێک دواتر بۆ هەناسەیەک سەیرم کرد، نەمناسییەوە: دانیار دانیشتبوو و سەری داخستبوو، داهێزرابوو وەکوو بەسانایی بیەوێت دوای ڕۆژێکی درێژی کارکردن پشوو بدات.

پەرێزی هەرەوەزییەکەی ئێمە ئەو زەویوزارە فراوانە بوو کە لافاوی چەمی کورکۆریو ئەیگرتەوە، نزیک گوندەکەی ئێمە ڕووبارەکە لە درە شاخێکەوە دەرئەپەڕی و هاژەی ئەکردە خوارەوە ناو دۆڵەکە بە سەرکێشی و نەعرەتەوە. وەرزی دروێنە، کاتی ژیانەوەی ڕووبارە شاخاوییەکان بوو. ئێواران قوڕاو و کەفی چەمەکە زیادی ئەکرد. نیوەشەو لە هاڕەی چەمەکە لە خێوەتەکە لەخەو هەڵئەستام و ئەستێرەکانی ئاسمانی شینی بێدەنگم ئەبینی بەدزییەوە سەیری کزە ساردەکە، گرمە لەپڕەکان و خاکە نووستوەکەی ئەکرد، چەمە تووڕەکەش وا دیار بوو ڕووی ئەکردە ئێمە هەڕەشەمان لێ بکات. لەگەڵ ئەوەی ئێمە زۆر نزیکی کەنارەکە نەبووین، هەستم بە نزیکیی ئاوەکە ئەکرد و

ترسێکی نابەدڵ دایئەگرتین بدات بە سەرمانا و خێوەتەکەمان شڕ و وڕ بکات و لەگەڵ خۆیدا ڕاپێچێت.

هاوڕێکانم وەکوو مردوو خەوتبوون، بەڵام من ئۆقرەم نەئەگرت و ئەچوومە دەرەوە.

شەو لە دارستانەکانی کورکۆریو هەم جوانە و هەم ترسناکە، تارمایی ئەسپە بەستراوەکان لەناو پاوانەکەوە لێرەوە ئەبینرێن، تێریان گیای تەڕ خواردووە و ئێستا کاوێژ ئەکەن و بەهێواشی ئەپرمێنن. لەولاشەوە بەردی چەمی کورکۆریو بە دەنگێکی ناسازەوە بەرزەگیا گوڵدارە تەڕەکان ئەداتە بەر قامچی و ئەیاننووشتێنێتەوە. ڕووبارە بێئارامەکە شەو پڕ ئەکات لە دەنگی نامۆ و ترسناک.

لە شەوانی لەو جۆرەدا من هەمیشە بیر لە دانیار ئەکەمەوە، هەمیشە لەسەر کۆمەڵێک سرووت[٢٢] ئەخەوێت لە گوێی ئاوەکە. چۆن ناترسێت؟ چۆن هاژەی چەمەکە کەڕی ناکات؟ بەڕاست لەوێ خەوی لێئەکەوێت؟ بۆچی شەو بەتەنیا لەو کەنارە ئەمێنێتەوە؟ چی هێزێک پاڵی پێوە ئەنێت بۆ ئەوێ؟ پیاوێکی نامۆ بوو، پیاوێک لە جیهانێکی ترەوە. ئێستا کوا؟ سەیرێکی چواردەورم کرد، بەڵام کەسم نەدی.

هەردوو کەنـــارەکە دریـــژ ئەکشـــێن بەرەو گـــردۆڵکە نزمەکان و زنجیرەچیاکان لە تـاریکییەکەدا دیـارن، لەوێ لەسەر لوتکەکانیان هەر بێدەنگی و ئەستێرەیە.

کاتێ ئەوەیە وا بیر بکەیتەوە دانیار ئیتر ئەبێ هاوڕێی پەیدا کردبێت لەنـاو ئـاوایی، بەڵام وەکـوو جـاران هەر خۆی بوو، وەکوو ئەوەی مانـای وشـەی هـاوڕێیەتی و دوژمنایەتی و سۆز و کینە هەر نەزانێت. لە دێهاتـان کە یەکێک بە پیاو دانرا؛ ئیتر ئەبێت بەرگری لە خۆی و لە هاوڕێکانیشی بکات، ئیشی باش و خراپیش بکات، ئەبێت بزانێـت چـۆن هاوشـانی ڕیشســپییەکان لە خۆشـی و ناخۆشـــیدا هەڵســـوکەوت ئەکـات و ئەبـــێ بە جێـــی باسوخواسی ژنان.

بەڵام کاتێک کەسێک وەکوو دانیار خۆی دوورەپارێز ئەگرێت و بەشداریی کاروبارەکانی ئاوایی ناکات، خەڵک یـان هەسـت بە بـوونی نـاکەن یـان بە کەمـی دائەنـێن و ئەڵێن: "ئەمە نە قازانجی هەیە نە زیان، بەستەزمانە هەر ئەوەی لەدەست دێ، لێی گەڕێ با وا بێ."

وەک بـاوە، کەسـی ئـاوا یـان جێـی گـاڵتەپێکردن یـان بەزەییپیاهـاتنەوەیە. ئـێمەی گەنجـان هەوڵمـان ئەدا لە تەمەنی خۆمان گەورەتر دەربکەوین، بۆ ئەوەی خەڵک وەکوو ژیجیت (پیاوی ماڵ) سـەیرمان بکەن. لە پاشـملە بە دانیـار پێئەکەنیین، بەڵام لە ڕووی خۆیـا نەمـانئەوێرا، هەتـا بەوەش پێئەکەنیین کە بە دەسـتی خـۆی کراسـە

عەسکەرییەکەی لە چەمەکە ئەشۆرد، ئەیشۆرد و پێش ئەوەی وشک بێتەوە؛ هەر بەتەڕیی لەبەری ئەکردەوە، چونکە کراسی تری نەبوو.

سەیر ئەوە بوو لەگەڵ ئەوەی دانیار میانڕەو و خۆپارێز دیار بوو؛ هەرگیز نەمانئەوێرا مامەڵەی دژی لەگەڵ بکەین، لەبەر ئەوە نا کە لە ئێمە گەورەتر بوو... سێ چوار ساڵ چییە؟ نەک لەبەر ئەوەش کە بەهێزتر و لەخۆبایی بوو کە ئەمەش جۆرێک لە ڕێزگرتنی ئەسەپاند، نەخێر، لەبەر ئەوەی لە دڵتەنگی و بێدەنگی و بیرکردنەوە قووڵەکانیدا شتێکی شاراوە هەبوو کە ڕێی لە ئێمە ئەگرت، ئێمە هەمیشە دڵخۆش ئەبووین هەلێکمان بۆ بڕەخسێ بە یەکێک ڕابوێرین.

لەو بڕوایەدام ڕووداوێک هەیە بووەتە هۆی ئەوەی هەڵوێستمان بەو جۆرە بێت بەرامبەری. من منداڵێکی مزیڕ بووم، پرسیارێکی زۆرم ئەکرد، حەزم ئەکرد هەموو شتێک بزانم، ئارەزووم ئەوە بوو هەموو شتێک دەربارەی جەنگ لەو سەربازانە بپرسم کە لە بەرەکان ئەهاتنەوە. کە دانیار هات لای ئێمە ئیش بکات، بۆ دەرفەتێک ئەگەڕام شتێک لەم کۆنەسەربازە دەربێنم.

ئێوارەیەک دوای نانخواردن لە کەمپەکە لەدەوری ئاگرێک کۆ بووبووینەوە بۆ ئیسراحەت، لێم پرسی: "دانیار، تا نەخەوتووین شتێکمان بۆ باس کە دەربارەی جەنگ."

لە سەرەتاوە تۆزێک بێدەنگ بوو، هیچی نەوت، وەکوو پێشی ناخۆش بێت؛ ماوەیەکی زۆر چاوی بڕییە ئاگرەکە و لە کۆتاییدا سەری هەڵبڕی سەیری ئێمە بکات.

"دەربارەی جەنگ؟" پرسیاری کرد. دواتر وەک خۆی وەڵامی بیرکردنەوەکانی خۆی بداتەوە و بەرەقی لەسەری ڕۆیشت: "نا، باشترە هیچ نەزانیت دەربارەی جەنگ!"

لای کردەوە و مشتێک گەڵای وشکی هەڵگرت و خستیە سەر ئاگرەکە و دەستی کرد بە فوولێکردنی، بۆ ئەوەی سەیری ئێمە بکات.

دانیار هیچی تری نەوت، بەڵام ئەو چەند وشەیەی وتی؛ وای لێ کردین تێبگەین جەنگ بابەتێک نییە کەسێک بتوانێ بەئاسانی باسی بکات، جەنگ چیرۆکی کردنە خەو نییە، جەنگ وەکوو کڵۆیەک خوێن لە دڵی ئەو پیاوەدا مەییوە و باسکردنی ئاسان نییە، هەستم بە شەرمەزاری کرد و هەرگیز جارێکی تر دەربارەی جەنگ پرسیارم لێ نەکرد.

زۆر زوو ئەو ئێوارەیەمان لەبیر چوو، بەو خێراییەی ئەهلی ئاوایی چاویان لەسەر دانیار نەئەما.

ڕۆژی دوایی بەیانی زوو من و دانیار ئەسپەکانمان هێنا بۆ سەر خەرمانەکە، جەمیلەش هات، لە دوورەوە

چاودێریی ئێمەی ئەکرد، بانگی کرد: "هۆی شووبرا، ئەسپەکانم بۆ بێنە بۆ ئێرە! ئەی کوا شتەکانی ترم؟"

ئینجا وەستایانە عەرەبانەکەی سەیر کرد، وەکوو هەموو ژیانی عەرەبانچی بووبێت، بزانێت ئەڵقەکانی پێچکەکان شل نین و لە جێی خۆیاندان و نووکەشەقی تێهەڵئەدان تا دڵنیا بێت بووشەکان تەواون.

کە من و دانیار بە سواری ئەسپەکانمان بەرەو ڕووی ڕۆیشتین، شێوەمان لەبەر چاوی ئەو پێکەنیناوی بوو. دانیار درێژ و قاچە ڕووتە لاوازەکانی لەناو جووتێک جزمەی مشەمای زۆر دەڵب کە هەموو چرکەیەک خەریک بوو لە پێی دائەخزان، منیش بە پێی پەتی بە پاژنە چڵکنە ڕەشەکانم ئەمژەندە ئەسپەکەم.

"کە دووانی جوانن!" بەراپواردنەوە سەری با ئەدا. ئیتر دەستی کرد بە فەرمانکردن بەسەرمانا: "خێرا کەن! ئەبێ پێش ئەوەی گەرما بکا، پێدەشتەکە ببڕین!" جڵەوی هەردوو ئەسپەکەی گرت و ڕایکێشان بۆ لای عەرەبانەکە و بەبڕوابەخۆبونەوە بەستنی، بەتەنیا خۆی. یەک جار لێی پرسیم نیشانی بەم چۆن جڵەوەکان ئەبەسترێن، ئاگای لە دانیار هەر نەبوو، وەکوو هەر لەوێش نەبێت.

دانیار حەپەسابوو لەو دەستوبرد و چاونەترسی و بڕوابەخۆبوونە، لەو دوورەوە وەستابوو، هەردوو

لێوەکانی توند نووقاندبوو، ڕوانینەکەی هاوڕێیانە نەبوو، بەڵام سەرسامییەکی شاراوەی پێوە دیار بوو.

فەردەیەک گەنمی لەسەر قەپانەکان دا بە کۆڵیا و بێدەنگ فڕێی دایە عەرەبانەکەوە، جەمیلە لێی تووڕە بوو: "وا ئەزانی ئەبێت هەر کەسێک بەتەنیا بۆخۆی ئیش بکات؟ نا برادەر، شتی وا نابێت. وەرە، دەستتم بەرێ! ئەوە بۆ لەویا دەستبەتاڵ وەستاوی شووبرا؟ سەر کەوە سەر عەرەبانەکە و فەردەکان هەڵچنە!"

جەمیلە دەستی دانیاری گرت، دەستباری[23] فەردەکەیان دا و بەرزیان کردەوە، بەستەزمانە لە تەریقییا سوور بووبووەوە. دوای ئەوە هەر فەردەیەکیان ئەتلانەوە بەسەر قۆڵیانا، دەستی یەکتریان ئەگوشی و بەرزیان ئەکردەوە و سەریان ئەنا بە سەری بەیەکەوە، هەستم بە تێکچوون و شڵەژانی دانیار ئەکرد چۆن لێوەکانی توند ئەگەزێ و هەوڵ ئەدا سەیری دەموچاوی جەمیلە نەکات.

بەڵام ئەو یەک دەنک بە خەیاڵیا نەئەهات، وا دیار بوو هیچ ئاگای لەوە نییە یەکێک یارمەتیی ئەدا و لەگەڵ ژنەکانی سەرقەپانەکان شۆخییان ئەکرد. کە عەرەبانەکە بار کرا و لغاوەکانمان گرت، بەمەکرەوە چاوێکی داگرت و بەپێکەنینەوە وتی: "هێی، تۆ ناوت چییە؟ دانیار؟ وەک چۆن دیارە پیاویت، ئەبێ ئاواش پێشمان کەویت!"

دانیار جڵەوەکەی شل کرد و بێدەنگ دەرچوو. "ئەی نەگبەت!" لە دڵـی خۆمـا وتـم: "بـۆ لە هەمـوو شـتێکا ئەوەندە شەرمنی!"

ڕێگەکەمـان زۆر دوور بـوو: پـانزە میـل دەشـتایی، ئەوجا بە دۆڵێکا بۆ وێستگەی شـەمەندەفەرەکە. تەنیـا شتی باشی ئەو ڕێگایە ئەوە بوو هەمووی سـەرەوخوار بوو و ئەسپەکان ماندوو نەئەبوون.

ئـێمە ڕۆژی کاروانێکمـان ئەکـرد، بەیانیـان زوو دەرئەچـووین و پاشـنیوەڕۆ ئەگەیشـتینە وێسـتگەی شەمەندەفەرەکە.

گونـدەکەمان کەوتبـووە سـەر کەنـاری کورکوریـۆ لەسـەر لاپـاڵی کـۆمەڵێ شـاخی بەرز. ئاواییەکەمـان بە ترۆپکی درەختە ڕەشـەکانیەوە تا ئەگەیشتیتە دۆڵەکە، لێتەوە دیار بوو.

ئـێمە ڕۆژی کاروانێکمـان ئەکـرد، بەیـانی زوو دەرئەچـووین و پاشـنیوەڕۆش ئەگەیشـتین. ڕۆژ بێڕەحمانە هەڵیئەقرچاندین، وێستگەش ئەوەندە جەنجاڵ بوو ڕێگات بەر نەئەکەوت بڕۆیت: پڕ بوو لە عەرەبانە و ماشین کە هەڵچنرابـوون لە فەردە گەنـم و لە هەمـوو دۆڵەکەوە هـاتبوون، هێسـتر و گـا بـار کرابـوون و لە هەرەوەزیـی دێهـاتە شـاخاوییە دوورەدەسـتەکانەوە هاتبوون، منـاڵ و ژنی سـەربازەکان لێیان ئەخـوڕین کە

خــۆر دەموچــاوی ســـووتاندبوون و جلەکــانی کــاڵ کردبوونەوە، پێپەتییەکانیان ئەوەندە بە ڕێی بەردەڵاندا ڕۆیشتبوون ڕەق ڕەق بووبوون، لێوەکانیان بە گەرما و تەپوتــۆزی ڕێگــا وشــک هەڵاتبــوون و قڵیشــابوون و خوێنیان لێ هاتبوو.

لە دەرگــای عەمــارەکە درووشــمێک هەڵواســرابوو، نووســرابوو: "هەمــوو گلکەشــامییەک[٢٤] بــۆ بەرەکــانی جەنگ". لە حەوشەکەشدا پاڵنان و قرەقرِ و دەنگەدەنگی وڵاخدارەکان هەر مەپرسە. لەو نزیکە، لەپشت دیوارێکی نــزمەوە، لــۆرییەک ئەهــات و ئەچــوو بگــاتە شــوێنەکە، گرەیەکی گەرم و دووکەڵێکی خەستی بڵاو ئەکردەوە کە بـــۆنی کـــانزای ســـووتاوی لـــێ ئەهـــات، شـــەمەندەفەرەکانیش وەکـــوو هەورەبرووســـکە ئەیانگرمانــد، حوشــترەکانیش نەیانئەویســت لە جێــی خۆیان هەستن و بەبێزارییەوە دەمیان فراوان کردۆتەوە و کەف لە دەمیان ئەچۆڕا و زەوییەکەی تەڕ ئەکرد.

چیاکانی دانەوێڵە هەڵڕژاوەکە لەژێر بانێکی ئاسنی بە گەرما سوورەوەبوو هەڵدرابووەوە. فەردەکان ئەبووایە بەســەر تاکۆســێکی[٢٥] تەخــتەدا ســەر بخــرایە بــۆ ژێــر سەقفەکە. هەواکەی قورس و بۆنی گەنمی لێ ئەهات، تەپوتۆزیش پیاوی ئەخنکاند.

لە ژێــرەوە یەکێــک لەوانەی گەنمــی وەرئەگــرت کە چاوەکانی لە کەمخەویدا سوور بووبوون، هاواری کرد:

"هێی، تۆ! ئاگات لە هەنگاوەکانت بێت، سەری خە بۆ سەرەوە!" مستی ڕائەوەشاند و جنێوی ئەدا.

ئەوە بۆ جنێو ئەدا! خۆمان ئەزانین بیبەین بۆ کوێ و هەر بردووشمانە بۆ ئەوێ. دوای ئەوەش ئێمە ئەو فەردە گەنمەی ئەیدەین بە کۆڵمانا، لە چەندین کێڵگەوە هاتووە کە ژن و منداڵ و ڕیشسپی توویان کردووە و بەرهەمیان هێناوە و لە گەرمای وەرزی دروێنەدا شۆفێری کۆمباینەکانیش ڕەنج ئەدەن و بەو مەکینە کۆنانە کە زۆر دەمێکە تەمەنی بەکارهێنانیان بەسەرچووە؛ ئەیدروونەوە، لەو شوێنەی ئافرەت پشتیان چەماندۆتەوە بەسەر داسە داخبووەکانیاندا و منالانیش بە دەستەکانیان بەوردی ئەو گلکانە ئەچننەوە کە ڕژاون.

ئێستاش لەبیرمە ئەو فەردانە چەند قورس بوون، ئیشی پیاوێکی تێروپڕ بوون. من بەسەر ڕەمپەکەدا کە لەژێر پێما ئەلەقی و جیرەی ئەهات، هاوسەنگیی خۆم ڕائەگرت و گوێچکەی گوێنییەکەم توند بە دانم ئەگرت بۆ ئەوەی نەخزێت. قورگم پڕ بووبوو لە تۆز، پەراسووەکانم لەژێر قورسیی فەردەکەدا ئەنوشتانەوە و ئەڵقەی بریسکاوەی سەوز و سوور بەبەر چاوما سەمای ئەکرد. زۆر جار بەتایبەتی ئەو کاتانەی سەرم گێژی ئەخوارد؛ ئەمزانی چار نییە ئەبێت فەردەکە بخزێت، تەنیا بیرکردنەوەم ئەوە بوو لێی گەڕێم بخزێت

و خۆم لەگەڵیا بکەومە خوارەوە، بەڵام خەڵکی ترم لە دواوە بوون، ئەوانیش فەردەیان بە کۆڵەوە بوو، گەنج بوون لە تەمەنی مندا، یان ژنانی مێرد سەرباز کە کوڕیان لە تەمەنی مندا بوو. ئەگەر جەنگ نەبووایە، کێ ناچاری ئەکردن کۆڵی وا بدەن بە کۆڵیانا؟ نا، مافی ئەوەم نەبوو بارەکەم فڕێ دەم، مادام ژن هەیە هەمان کاری من ئەکات.

ئەوە جەمیلەیە لە پێشمەوە، کراسەکەی هەتا پشت ئەژنۆیەوە هەڵکردووە، چاوم لێیە چۆن ماسوولکەکانی پووزە ئەسمەرە جوانەکانی گرژ بوون، ئەمبینی چەند ئەرکێکی قورسە لەشولارە بچکۆلەکەی چەسپاو بگرێت کاتێک لەژێر قورسیی فەردەکەدا نوشتاوەتەوە. هەندێ جار چەند چرکەیەک سرەوتی ئەدا، وەکوو هەست بەوە بکات لەگەڵ هەموو هەنگاوێکا بێهێزتر ئەبم.

"خۆت ڕاگرە شووبرا، زۆرمان نەماوە!" بەڵام هەستم ئەکرد خۆیشی دەنگی مردووە و دەرنایەت.

کە گوێنییەکانمان بەتاڵ کرد و گەڕاینەوە؛ دانیارمان بینی سەر ئەکەوت، تۆزێک ئەلەنگی، بەڵام هەنگاوەکانی بەهێز و هاوسەنگ، وەکوو عادەتی خۆی تەنیا و بێدەنگ، کە کەوتە لاشانمان؛ دانیار نیگایەکی تاڵ و گەرمی جەمیلەی کرد.

ئەویش پشتە ماندووەکەی ڕاست کردەوە و کراسە چــرچەکەی دادایەوە. هەمـــوو جارێــک کە ســـەیری جەمـیلەی ئەکـرد؛ وەکـوو یەکەم جـاری بێـت بیبینێـت، بەڵام جەمیلە بەردەوام بوو لە حسابێۆنەکردنی.

بووبوو بە ئاکاری، بەپێی مەزاجی خۆی، جەمیلە یان پێی پێئەکەنـی یـان وای دائەنـا هەر نییە. کە بەیەکەوە ئەڕۆیشتین، لەپڕ بانگی منی ئەکرد: "خێرا کە، با بڕۆین!" لەگەڵ هــاوار و ڕاوەشــاندنی قـامچی بەســـەر ســـەری خـۆیەوە و ئەسـپەکانی ئەخسـتە لـۆقە. دوای ئەکەوتـم، ئەماندا بەلای دانیارا و لەناو پەڵەیەک تەپوتۆزی خەستا ئەمانخنکانـــد، ئەبـــووایە مـــاوەیەکی پــێ بچـــووایە تـــا ئەڕەوییەوە و ڕێی خۆی ئەبینی.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە تەنیا بۆ خۆشـی بوو، بەڵام کەم کەس قبوڵی ئەکرد. دانیار دیار بوو گوێی نەئەدایە. کە بەتیـژی ئەمانــدا بەلایـدا، ســـەیرێکی سەرســامیی بــێ زەردەخەنەی جەمـیلەی ئەکـرد لەســـەر عەرەبـانەکەی وەستاوە و قاقا پێئەکەنێ.

ئـــــاوڕم ئەدایەوە، ئەمبینـــــی دانیـــــار لەنـــــاو تەپۆتۆزەکەشەوە هەر سەیری ئەکات. شتێکی دۆستانە و لێبـــووردووانەم لە نیگاکانیـــا بەدی ئەکـــرد، بەڵام دڵتەنگییەکـی ڕەگـداکوتاوی شـاراوەی هەر پێـوە دیـار بوو.

نه گاڵتەپێکردنی جەمیلە و نە پشتگوێخستنی، هەرگیز جارێـک دانیـاری تـووڕە نەئەکـرد، وەکـوو سـوێندی خواردبێت هەمووی قبوڵ بکات. لە سـەرەتاوە بەزەیـیم پیا ئەهـاتەوە، تا زۆر جار بە جەمیلەم ئەوت: "بۆ پێی ڕائەبوێریت، براژن؟ پیاوێکی باش و بێوەیە!"

"ئۆه!" پێئەکەنی و شـانی هەڵئەتەکاند: "ئەوە تەنیـا بـۆ خۆشییە. مەترسە، ئەو قرژاڵە هیچی بۆ نابێت!"

ئیتر منیش فێر بووم گاڵتەی پێ بکەم. نیگا گەرمە بەردەوامەکانی نیگەرانی کردبووم، چۆن کە فەردەیەکی ئەدا بە کۆڵیا چاوی تێ ئەبڕی! ڕاستت ئەوێ، جەمیلە خۆیشـــی ســـەرنجڕاکێش بـــوو، لەنـــاو ژاوەژاو و هاتوهوریای وێستگەکەدا، لەناو دەنگەدەنگی ئەو هەموو خەڵـکەی ئەهـاتن و ئەچـوون و پاڵیـان بەیەکەوە ئەنـا؛ بڕوابەخۆبـوونی جەمـیلە و هەنگـاوە ورد و بەئاگاکـانی سەرنجی خەڵکی ڕائەکێشا، وای ئەنواند لە شوێنێکی تر لە دەرەوەی سنووری گۆڕەپانەکە لەنجەولار ئەکات.

ئاسان نەبوو نەوەستیت و سەیری نەکەیت. بۆ ئەوەی فەردەیەک لە تەخـتەی عەرەبـانەکە داگرێـت؛ جەمـیلە ئەبـووایە خـۆی هەڵبڕیـایە و ڕووی وەربگێـڕایە، ئینجـا شانی بدایەتە ژێر فەردەکە و سـەری بخستایە بەپشتا، بە جۆرێک ئەوک[٢٦] و گەردنە جوانەکەی دەربکەوتـایە و هەردوو پەلـکە بە خـۆر سـوورهەڵگەڕاوەکەی تـا نزیـک زەوی شۆڕ بوونایەتەوە.

دانیار ئەوەستا، وەکوو ئەوەی بیەوێت پشوو بدات، بەڵام چاوەکانی هەتا دەروازەکە بەدوایەوە بوون، بێگومان وای ئەزانی کەس تێبینیی ناکات، من هەموو شتێکم ئەبینی و ڕقیشم لە هەموو ئەوە بوو ئەمبینی، هەستم بە سووکایەتییش ئەکرد، چونکە هەرگیز نەئەچووە عەقڵم دانیار لە ئاستی جەمیلەدا بێ.

"تۆ بیری لێ بکەرەوە، ئەگەر ئەو بەس ئاوا سەیری بکات، ئەبێ چی لە خەڵکی تر چاوەڕوان بکەیت!" قینم هەستا. خۆپەرستیی منداڵیم کە هێشتا لێی ڕزگار نەبووبووم، خستمیە دڵپیسییەکی ترسناکەوە. ئێستا لەجیاتیی ئەوەی بەزەییم بە دانیارا بێتەوە؛ بەخەستی ڕقم لێی بوو، زۆرم پێ خۆش ئەبوو کە یەکێک گاڵتەی پێ ئەکرد.

بەڵام ڕۆژێک گاڵتەکردنەکەمان خراپ کەوتەوە. لەناو فەردە گەنمەکانا جەوالێکی[٢٧] گەورەی حەوت تەنەکە[٢٨] و نیوی (٢٨٠پاوەند - ١٢٧کیلۆ) تیا بوو، لە بەنی خوری دروست کرابوو، عادەتەن ئێمە بە دوو کەس هەڵمانئەگرت، چونکە بەتەنیا هەڵنەئەگیرا. ڕۆژێک لە خەرمانەکە بڕیارمان دا پەنێک بە دانیاردا بدەین، کردمانە عەرەبانەکەی ئەوەوە و فەردەی ترمان لەسەر هەڵچنی.

لە ڕێگا من و جەمیلە لە گوندێکی ڕووسی لامان دایە باخێک هەندێ سێومان ڕنی، هەموو ڕێگاکە پێیەکەنیین

و جەمیلە بەردەوام سێوی تێ ئەگرت، وەک هەمیشە بەجێمان هێشت و تەپوتۆزەکەمان ئەکرد بەسەریا. لەودیوی دۆڵەکەوە لەسەر یەکتربڕی هێڵی شەمەندەفەرەکە پێمان گەیشتەوە، هێڵەکە داخرابوو، لەوێوە هەتا وێستگەکە بەیەکەوە ڕۆیشتین. ئێمە بەتەواوی جەواڵە گەورەکەمان لەبیر چووبووەوە و بیرمان لێ نەئەکردەوە تا ئەو کاتەی بارەکەمان بەتاڵ کرد.

جەمیلە هاروهاجانە بە ئەنیشکی تێی کوتیم و بە سەر بەرەو دانیار ئاماژەی بۆ کردم. لەسەر عەرەبانە کە وەستابوو، بەنیگەرانییەوە سەیری جەواڵەکەی ئەکرد و لەوە ئەچوو بڕیار بدات چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکات، دواتر سەیری چواردەوری خۆی کرد، کە هەستی بە جەمیلە کرد؛ زەردەخەنەیەکی کپ کردەوە، سوور هەڵگەڕا و تێگەیشت مەسەلە چییە.

"پانتۆڵەکەت توند کە، ئەگینا لە ڕێ لێت ئەکەوێتە خوارەوە!" جەمیلە هاواری کرد.

دانیار بەتووڕەییەوە سەیری ئێمەی کرد و پێش ئەوەی ئێمە تێبگەین نیازی چییە؛ جەواڵەکەی بەناو عەرەبانەکەدا ڕاکێشا تا گەیشتە قەراغی کۆتایی، بازی دایە خوارەوە، بە دەستێکی گوێچکەیەکی جەواڵەکەی گرت و ڕایکێشا و دای بە کۆڵیا و ڕۆیشت.

لە سەرەتاوە وا خۆمان نیشان دا ئەوە هیچ شتێکی نائاسایی تیا نییە، خەڵکی تریش بێگومان هەستیان بە هیچ نەکرد: پیاوێک فەردەیەک هەڵئەگرێت وەکوو هەر کەسێکی تر. کاتێک دانیار نزیکی ڕەمپەکە بووەوە، جەمیلە گەیشتە لای.

"فڕێی دە ئەو فەردەیە، گاڵتە ئەکەم!"

"بڕۆ لا چۆ!" بە دەنگێکی پچڕەوە وتی و دەستی کرد بە سەرکەوتن.

"سەیر کە، خۆ داینەنا!" جەمیلە هاواری کرد، وەکوو پاساو بۆ کردەوەکەی بێنێتەوە. هێشتا بەناسکی پێئەکەنی، خاو بووەوە، وەکوو خۆی ناچار بکات پێبکەنێت.

هەستمان کرد دانیار زیاتر شەلییەکەی پێوە دیارە. بۆچی پێشتر بیرمان لەوە نەکردبووەوە؟ تا ئەمڕۆش لە خۆم نابوورم بۆ ئەو کارە بێعەقڵییە، ئەوە من بووم ئەو کەرێتییەم کرد، بیرم لەو پێڕابواردنە کردەوە!

"وەرە دواوە!" جەمیلە بەپێکەنینە ساردەکەیەوە هاواری کرد، بەڵام دانیار نەیئەتوانی بگەڕێتەوە، چونکە خەڵکی تری لە دواوە بوو.

بەتەواوی نایەتەوە خەیاڵم دوای ئەوە چی ڕووی دا. دانیارم بینی لەژێر قورسیی بارەکەدا دوو قات چەمابووەوە، سەری دانەواندبوو، لێوەکانی توند

گەستبوو، هێواش هێواش ئەجوولا، بەوشیارییەوە قاچە پێکراوەکەی ئەجوولاند.

هەمـوو هەنگـاوێکی تـازە؛ ئـازارێکی زیـاتری ئەدا، سـەری هەڵئەبـڕی سـەیرێکی سـەرەوەی ئەکـرد و بـۆ چـرکەیەک نەئەوەسـتا. تـا بەرزتـر بـووایەتەوە؛ زیـاتر بەمـــدیودیودا ئەجـــوولا، جەواڵەکە وای لـــێ کردبـــوو لەتـــری[٢٩] ئەدا. لە خەجاڵەتییـا تـف لە دەممـا وشـک بووبـوو، لە ترسـا ئەلەرزیـم، هەمـوو ئەنـدامانی لەشـم هەســـــتی بە قورســـــیی بـــــارەکەی و ئـــــازاری تەحەمـولنەکراوی لاقە پێکـراوەکەی ئەکـرد. جـارێکی تـر هەڵنوت و سەری هەڵبڕییەوە، هەمـوو دنیا لەبەر چاوم خـولایەوە و سـەرم بەگێـژەوە هـات، زەوی لەژێـر پێمـا دائەچوو.

هـاتمەوە هـۆش خـۆم، یەکێـک بەتونـدی بـاڵی گـرتم، یەکسەر جەمیلەم نەناسییەوە، وەکوو جاوی[٣١] سپیی لێ هاتبوو، چاوەکانی دەرپەڕیبوون، لێوەکانی دوای دواپین زەردەخەنەی ئەلەرزین.

نەک هەر ئێمە، هەر چییەک لەویا بوو، بە کارمەندی گەنـــم وەرگرتنەکەشـــــەوە ڕایـــــانکرد بـــــۆ بەردەم داربەسـتەکە. دانیـار دوو هەنگـاوی تریشـی نـا، ویسـتی هاوســەنگیی جەواڵەکە ڕابگرێـت، لەســـەر ئەژنۆیەکیـان چـــۆکی دادا، جەمـــیلە هەردوو دەســـــتی گـــــرت بە دەموچاویەوە.

"فرێی دە! وازی لێ بێنە!" جەمیلە قیژاندی.

بەڵام دانیار فرێی نەدا، هەر چەند ئەیتوانی بە دیوێکا بیخاتە خوارەوە بۆ ئەوەی بەر ئەوانەی دوای خۆیەوە نەکەوێت. کە گوێی لە دەنگی جەمیلە بوو؛ تەکانێکی دا و ڕاست بووەوە سەر هەردوو پێی و هەنگاوێکی تری نا، دیسانەوە خۆی نەئەگرت و بەمدیودیودا ئەکەوت.

"دە فرێــی دە ســەگباب!" کارمەنــدی وەرگــرتنەکە لە خوارەوە هاواری کرد.

"فرێی دە!" خەڵکەکە هاواریان ئەکرد.

دانیار ئەم جارەش ڕێک وەستایەوە.

"نا، فرێی نادا!" یەکێک بەبڕواوە چپاندی.

هەر چی لەو ناوەدا بوو، ئەوانەی لە دوایەوە بوون و ئەوانەی خـوارەوە، تێگەیشـتن فرێـی نـادات تـا خۆیشـی لەگەڵیا نەکەوێتە خوارەوە. بێدەنگییەکی کوشندە...

لەپشت دیوارەکەشەوە لەودیوەوە هەر گرمە ئەهات.

دانیــار بەردەوام بــوو لە ســەرکەوتن بەرەو ســەقفە چینکۆ داخبـووەکە، بەمـلاولادا ئەکەوت وەکـوو یەکێـک هۆشی بەخـۆی نەبێت، پلەکانی داربەستەکە لەژێر پێیا ئەنیشتن.

هەمــوو دوو هەنگاوێــک ئەوەســتا خــۆی هاوســەنگ بکاتەوە و هێز بداتەوە بەر خۆی و بەردەوام ئەبووەوە.

ئەوانەی لە دوایەوە بــوون هەماهەنگییــان ئەکــرد، کە ئەوەستا؛ ئەمانیش ئەوەسـتان. ئەمە شـەکەتی کردبوون، هێــزی لەبەر بڕیبــوون، بەڵام کەس تــوورە نەئەبــوو، کەسیش جنێوی پێ نەدا.

خەڵــکەکە بە کــۆڵە قورســەکانیانەوە بەدوایــا ســەر ئەکەوتــن وەکــوو بە پەتێکــی نەبینــراو بەیەکەوە بەسترابنەوە و بە هەورازێکی خزی مەترسیداردا سەر کەون و ژیـانی هەریەکێـک بەسـترابێ بە ژیـانی ئەوی ترەوە. ئاوازێکی قورس لە بێدەنگی و بەملاولاداکەوتنی هەموویانـدا هەبـوو. هەنگاوێـک، هەنگـاوێکی تـر بەدوای دانیارا و هەنگاوێکی تریش...

مــاوەیەکی کەم مــابوو بیبــڕێ، بەڵام دانیــار لەتــری دایەوە، قاچە پێکراوەکەی لەوە زیاتر بەگوێی نەئەکرد. بێگومان ئێستا ئەکەوێتە خوارەوە، ئەگەر جەواڵەکە فڕێ نەدا.

"ڕاکە! لە دواوە یـارمەتیی بـدە!" جەمـیلە هـاواری کـرد بۆ من، بێئومێدانە باوەشـی کردبووەوە وەکوو بیەوێت لە دواوە بیگرێت.

بەڕاکردن بەسەر داربەستەکەدا خۆم ئەکرد بە بەینی خەڵکەکــان و فەردەکانــا تــا گەیشــتمە دانیــار، لەژێــر ئەنیشــکیەوە ســەیرێکی کــردم، دەمارەکــانی لەســەر نــاوچەوانە ڕەشــە تەڕەکەی هەســتابوون، چــاوە

خوێنتێزاوەکانی بەڕقەوە سەیری منیان ئەکرد. ویستم لە دواوە فەردەکە بگرم: "دەستی لێ نەدەی!" بۆڵەیەکی لێوە هات و بەردەوام بوو.

کە سەرئەنجام ئەهاتەوە خوارەوە؛ ئەشەلی و هەناسەبڕکێی بوو، دەستەکانی بەشلی بە تەنیشتەکانیا شۆڕ بووبوونەوە. خەڵکەکە خۆیان لا ئەدا ڕەت بێت، بەلام کارمەندی وەرگرتنەکە خۆی پێنەگیرا قیڕاندی: "ئەرێ تۆ شێتی؟ من بە مرۆڤ نازانی؟ وا ئەزانی نەمئەهێشت لە خوارەوە خاڵیی بکەیت؟ بۆ باری وا قورس ئەدەی بە کۆڵتا؟"

"ئەوە ئەرکی سەرشانمە." دانیار بەهێمنی وەلامی دایەوە.

بەولادا تفێکی کرد و بەرەو عەرەبانەکەی ڕۆیشت، ئێمە نەمانئەوێرا سەیری بکەین و خەجاڵەت و لە دانیار تووڕە بووین کە ئەو گاڵتەیەی ئێمەی بەڕاستی وەرگرت.

بە درێژیی شەو بەبێدەنگی لێمان ئەخوری. دانیار خۆی تەبیعەتی هەر وا بوو، نەمانئەزانی لە ئێمە تووڕەیە یان تەواوی ڕووداوەکەی لەبیر کردووە، بەلام ئێمە ویژدانمان ئازاری ئەداین و تێک شکابووین.

بەیانی دواتر، کە خەریکی بارکردن بووین لەسەر خەرمانەکە، جەمیلە ئەو جەواڵە نەگریسەی گرت و قاچی نایە سەر و پارچە پارچەی کرد.

"ها، ئەم جەواڵە کۆنە شڕە بۆ تۆ!" فڕێی دایە بەر پێی کارمەندە حەپەساوەکەی سەر قەپانەکە: "بە سەرۆکی تیم بڵێ جارێکی تر شتی وامان بۆ نەهێنێت!"

"ئەوە چی بووە؟ چی ڕووی داوە؟"

"هیچ!"

ڕۆژی دواتر دانیار وەک هەمیشە بێدەنگ و لەسەرخۆ ئیشی کرد، بێ ئەوەی هەستێک دەرببڕێ، بەڵام زیاتر ئەشەلی، بۆیە لێوەکانی ئەگەست بەتایبەتی کە فەردەیەکی بار ئەکرد. زامە کۆنەکەی قاچی کولابووەوە، ئەوەش بەردەوام تاوانەکەی خۆمانی بیر ئەهێنایەوە.

بەهەرحاڵ، ئەگەر پێبکەنیایە یان قسەیەکی خۆشی بکردایە؛ کۆتایی بەو گرژییە ئەهێنا. جەمیلەش وا خۆی نیشان ئەدا هیچ شتێکی ناسروشتی ڕووی نەداوە، کچێکی لەخۆڕازی، هەمیشە پێئەکەنی، بەڵام من ئەمزانی چۆن لە ناخی خۆیدا ئەتوێتەوە.

شەو درەنگ بوو کە گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە. دانیار لە پێشەوە ئەڕۆیشت، شەو زۆر جوان بوو. کێ هەیە ئەم شەوانەی ئاب نەزانێت بە ئەستێرە دوور و هەم

نزیکەکـــانیەوە! ئەســـتێرەیەک هەبـــوو: لەوە ئەچـــوو کەنارەکـــانی ســـەهۆڵ بێـــت، تیشـــکە بەســـتووەکانی ئەدرەوشـــایەوە کە لە ئاسـمانی تـاریکەوە بەسەرسـامی ئەیڕوانییە زەوی لە خـوارەوە. کاتێک بە دۆڵەکەدا ڕەت بـووین؛ زۆر سـەرنجم دا، ئەسـپەکان پەلەیماڵەوەیـان بـوو، نەرمەغاریـان ئەکـرد و چەوی ژێـر پێچکەکـان ئەکوترانەوە.

شـــەماڵ لە پێدەشـــتەکەوە بۆنـــوبەرامەی گـــوڵ و گژوگیـــای ئەهێنـــا، لەگەڵ بـــۆنی گەنمـــی گەییـــوی نەدووراوە، هەمـووی کە تێکەڵـی بـۆنی قیـر و ئـارەقەی ئەسپەکان ئەبوو؛ سەرمەستی ئەکردین.

لە بەرێـــکەوە ڕێگـــاکە تاشـــەبەردی ڕەشـــی بە درک داپۆشـــراو و لەوبەریشـــەوە لە قوولاییـــدا بەنـــاو چـــڕ و کۆڕپەچناری بەرزدا چەمی کورکوریۆی بێئارام هـاژەی ئەهـات. تاوناتاوێک دەنگی پەڕینەوەی شـەمەندەفەرێک ئەهات بەسەر پردێکی دوورا، دەنگی بەرکەوتنی پێچکە وردەکانی تا ون ئەبوو؛ ئەمایەوە.

شتێکی خۆش بوو بەفێنکی سوار بیت، سەیری پشـتی ئەســـپ بکەیـــت و گـــوێ لە شـــەوی هـــاوین بگریـــت و شەماڵەکەی بۆن بکەیت.

جەمیلە لە پێشمەوە ئەڕۆیشت، جلەوەکەی شل کردبوو، سەیری چواردەوری خۆی ئەکرد و لەبەر خۆیەوە بەهێواشی گۆرانییەکی ئەوت.

ئەمزانی بێدەنگیمان قورس ئەکەوێتەوە لای ئەو. هەرگیز نەئەکرا لە شەوێکی وادا بێدەنگ بیت... شەوێک بوو خوا بۆ گۆرانی دروستی کردبوو.

دەستی کرد بە گۆرانی، لەوانەیە بۆ ئەوە ئەیوت پەیوەندیمان بگێڕێتەوە بۆ ساتە شیرینەکانی یان بۆ خۆدەربازکردن لە هەستکردن بە تاوانباری. دەنگێکی بە لەرەی ناسکی هەبوو، گۆرانییە باوەکانی لادێی ئەوت: "کە تۆ ڕادەبووری دەسرۆکەکەم[١٦] با ئەدەم"، "خۆشەویستەکەم بەجێی هێشتم..." گۆرانیی زۆری ئەزانی و بە سانایی و سۆزەوە ئەیوتن، بە جۆرێک خۆش بوو گوێی لێ بگریت. لەپڕ وەستا و بانگی دانیاری کرد: "ئادەی دانیار، ئەوە بۆ گۆرانییەک ناڵێیت؟ ئەی تۆ هەرزەکار نیت؟"

"ئەوە نییە تۆ گۆرانی ئەڵێیت، جەمیلە!" بە تۆزێک شەرمەوە وەڵامی دایەوە، لغاوەکەی توند کرد: "گوێم لێتە، گوێم بۆ تۆ گرتووە."

"ئەی وا ئەزانیت ئێمە گوێمان نییە؟ کەس بەزۆر پێت ناڵێ، ئەگەر ناتەوێت؛ مەیڵێ!" جەمیلە دەستی کردەوە بە گۆرانیوتن.

کـێ ئەزانێـت بـۆچی داوای لـێ کـرد گـۆرانی بڵێـت! لەوانەیە هەر لەخۆیەوە، یان لەوانەیە بۆ ئەوەی دەرگای گفتوگۆی لەگەڵدا بکاتەوە. زۆرتر لەوەی دووەم ئەچێت، چـونکە دیسـانەوە هـاواری کـردەوە: "پـێم بڵـێ دانیـار، هەرگیز دڵداریت کردووە؟" پێکەنییەوە.

هیچی نەوت، جەمیلەش بێدەنگ بوو.

"بێگومان کەسێکی باشی دۆزییەوە بۆ گۆرانیوتن." لە دڵی خۆما وتم.

کە گەیشـتینە جۆگەلەیەکی بچـووک ڕێگـاکەی ئەبڕی؛ ئەسـپەکان هێـواش بـوونەوە، ناڵەکانیـان زیــخە زیـوینە تەڕەکەی ئەشـێلا. کە لە بـوارەکە کردمـانە ئەوبەرەوە، قامچی دا لە ئەسپەکان و دەستی کرد بە گۆرانییەک بە دەنگێکـی تاسـاو لەگەڵ هەمـوو چـاڵێکی ڕێگـاکەدا کـپ ئەبوو:

"چیاکانم، شاخە سپی و شینەکانم

لانەی باوباپیرانم."

دەمـی تـێکەڵ بـوو، کـۆکی و دوو بەیـتەکەی تـری بە دەنگێکی بەرزی تۆزێک گڕ تەواو کرد:

"شاخەکانم،

چیا سپی و شینەکانم

لانکەی ژیانم..."

دیسانەوە وەستایەوە، وەک لە چەند شتێک ترسابێت، بێدەنگ بوو.

من هۆی شەرمکردنەکەیم بەڕوونی لەبەرچاو بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کاریگەرییەکی قووڵ لە گۆرانییە شەرمنەکەیدا، لە وەستانەکەیدا هەبوو، دەنگێکی خۆشی بەلاوە بوو: ئاسان نەبوو بڕوا بکەیت ئەوە دانیارە.

"جوانە! جوانە!" هاوارم کرد.

"ئەوە بۆ پێشتر گۆرانیت نەوتووە؟ بیڵێ، بیڵێ بە ئارەزووی خۆت!" جەمیلە هاواری کرد.

ڕووناکییەک دەرکەوت، ئەوە کۆتایی دۆڵەکە بوو. شەماڵێک لە دۆڵەکەوە ئەهات. دانیار دەستی کردەوە بە گۆرانیوتن. وەکوو ئەوجا بە شەرم و نادڵنیاییەوە دەستی پێ کرد، کەم کەم دەنگی بەرز ئەبووەوە، دۆڵەکەی پڕ کرد، دار و بەردی ڕەوەزەکان دەنگی ئەدایەوە.

ئەوەی زۆر سەرسامی کردم؛ سۆز و گڕی گۆرانییەکە بوو، نەمئەزانی ناوی بنێم چی، تا ئێستاش نازانم، ناتوانم دیاری بکەم ئایا دەنگەکەیە بەتەنیا یان شتێکی گەورەترە، شتێک کە لە ڕۆحی مرۆڤەوە دێت، شتێک کە ئەتوانێ هەمان کاریگەریی لەوی تردا دروست بکات، کاریگەرییەک ئەتوانێ ژیان بکات بە بەری بیرکردنەوە شاراوەکانی مرۆڤدا.

خۆزگە ئەمتوانی بە هەر جۆرێک بێت گۆرانییەکەی دانیارم بیر بکەوێتەوە! وشەگەلێکی وای تیا نەبوو، بەلام بەبێ وشەش؛ دڵ و دەروونێکی گەورەی مرۆڤێکی دەرئەخست.

نە پێشتر و نە دواتر هەرگیز گوێم لە گۆرانییەکی وا نەبووە: نە کەرگیزی بوو نە کازاخی بوو، بەلام تامێکی لە هەردووکیان تیا بوو. دانیار جوانترین ئاوازی هەردوو میللەتەکەی تێکەڵ کردبوو، وای بەیەکەوە گرێ دابوون ئاوازێکیان دروست کردبوو هەرگیز دووبارە نەبێتەوە.

ئەمە گۆرانیی چیا و پێدەشت بوو، جاربەجارێک هەڵئەکشا بۆ لوتکە وەکوو چیاکانی کەرگیزیا و فراوان و بێسنوور، تەخت ئەبوو وەکوو دەشتاییەکانی کازاخ.

تا گوێم بگرتایە، زیاتر و زیاتر سەرسام ئەبووم: "ئەمە ڕاستیی دانیارە! کێ هەرگیز لەم بڕوایەدا بووە؟"

کاتێک دەشتەکەمان ئەبڕی بە ڕێگا ئاسان و پڕ هاتوچۆکەدا؛ دانیار دەنگی لێ هەڵبڕی، ئاوازی تازە بە سۆزی دڵڕفێن یەک بەدوای یەکدا ئەهاتن.

ئەم کوڕە ئەوەندە بەهرەمەندە؟ چیی بەسەر هاتووە؟ وەکوو ئەوە وا بوو چاوەڕوانی ئەم ڕۆژە بێت، بۆ ئەم سەعاتە بگەڕێ!

لەپڕ ئەو ئاکارانەی تێگەیشتم، مایەی ئەوەیە خەڵک پێی پێبکەنن و گاڵتەی پێ بکات... خەیاڵاوییەکەی، حەز لە تەنیایی کردنەکەی، بێدەنگییەکەی... تێگەیشتم بۆ ئێواران لەسەر گردی پاسەوانییەکە ئەباتە سەر و شەوانیش بەتەنیا لەسەر کەناری چەمەکە، بۆ گوێی هەڵئەخست بۆ دەنگێک کەسی تر نەیئەبیست، بۆ چاوەکانی لەپڕ ئەگڕان و برۆکانی بەرز ئەکردەوە!

کەسێک بوو لە عەشقێکی قووڵدا بوو، هەستم کرد عیشقەکەی بۆ کەسێکی بەرامبەر نییە، عەشقێکی جیاواز، عەشقێکی بێکۆتایی بوو بۆ ژیان، بۆ خاک. بەڵێ، ئەم عەشقەی لە خۆیا حەشار دابوو، لە زایەڵەکەیدا... ئەوە ڕێ ڕووناککەرەوەی بوو. کەسێکی بێمشوور هەرگیز ناتوانێت ئاوا گۆرانی بڵێت، گرنگ نییە چەند دەنگی خۆش بێت.

کاتێک پێدەچوو دوا ئاواز ببڕێتەوە؛ بەدوایدا شەپۆلێکی تری خەوزڕێن ئەیویست دەشتە خەواڵووەکە خەبەر کاتەوە، دەشتەکەش بەئەمەکەوە گوێی لە ئاوازە شیرینە میللییەکەی گۆرانیبێژەکە ئەگرت، وەکوو ختووکەی بدات.

پەڵەگەنمە گەییوە زەردەکانی چاوەڕوانی دروێنە بوون، وەکوو ڕووی دەریاچەیەک کەرویشکەیان ئەکرد و کازیوەی بەربەیان بە دەشتەکەدا ڕایئەکرد.

پەڵەچنارە کۆنەکانی لای ئاشەکە گەڵاکانیان شنەیان ئەکرد و لەوبەر چەمەکەوە ئاگری کەمپی درەوانەکان خەریک بوو ئەکوژانەوە، تارمایی سوارێکیش بێدەنگ بە کەناری چەمەکەدا بەرەو ئاوایی غاری ئەکرد، تاوێک لەناو باخەکەدا ون ئەبوو، تاوێک دەرئەکەوتەوە، با؛ بۆنی سێو و گەنمەشامی گوڵکردوو و تەپاڵەی گەرمی وشکی ئەهێنا.

دانیار بەردەوام بوو لە گۆرانیوتن، بێ ئەوەی گوێ بداتە هیچ، لە کاتێکدا شەوی تامەزرۆی ئاب بەبێدەنگی گوێی لێ گرتبوو، هەتا ئەسپەکانیش دەمێک بوو ڕەوتی خۆیان گۆڕیبوو، بێ سەرکێشی ئەڕۆیشتن نەک وشەکانی لێ تێک بدەن.

لەپڕ لە بەرزترین ئاستی گۆرانییەکەدا دانیار وەستا، خوڕییە ئەسپەکان و قامچیلێدان.

ئەمزانی جەمیلەش دوای ئەکەوێت، منیش خۆم ئامادە کرد دوای کەوم، بەڵام نەجووڵا، هەر لە جێی خۆی دانیشتبوو، سەری دانەواندبوو، وەکوو گوێ لە دوایین ڕستەکان بگرێت کە هێشتا لە هەوادا ئەخولانەوە. دانیار پێشمان کەوت، ئێمە هیچ کاممان قسەمان نەکرد تا گەیشتینە ئاوایی. پێویستی نەئەکرد بدوێین، چونکە وشە هەندێ کات ئەوە ناگەیەنێت کە مرۆڤ هەستی پێ ئەکات.

وا دیـار بـوو لەو ڕۆژەوە گۆڕانێـک هـات بەسـەر ژیانماندا، وەکوو ئەوەی هەتاهەتایە چاوەڕوانی شتێکی نـاوازە و ویسـتراو بـم ڕوو بـدات. بەیانیـان عەرەبانەکانمـان لەسـەر خەرمـانەکە بار ئەکرد و لێمـان ئەخوڕی بۆ ویستگەکە، پەلەمـان ئەکرد بگەڕێینەوە بۆ ئەوەی گوێمان لە دانیار بێت هەتا ماڵەوە گۆرانی ئەڵێت.

دەنگی بوو بە پارچەیەک لە من، لە هەمـوو شـوێنێک بەدوامەوە بوو، بەیانیان لەگەڵ دەنگی ئەوا بەناو وێنجە تەڕەکەدا ڕامئەکرد بۆ لای ئەسپە بەستراوەکان، خـۆر بەپێکەنیـنەوە لەپشـت چیاکـانەوە سـەری دەرئەهێنـا سڵاوم لێ بکات، گوێم لە دەنگی ئەبوو لە هاژەی بارانی گەنمـی ئاڵتوونیـدا کە بێژنگـی جووتیارەکـان بەبایـان ئەکـرد و ئەهـاتە خـوارەوە، لە سـووڕانەوەی بـازنەیی هەڵۆ تەنیاکاندا بە ئاسـمانی دەشـتاییەکەوە... لە هەمـوو شـتێکا ئەمـدی و ئەمبیست، گۆرانییەکـانی دانیـار ئەهـات بە خەیاڵما.

ئێـواران کە بارمـان ئەبـرد بە درێژیـی دۆڵەکە؛ وام هەسـت ئەکـرد گـوێزراومەتەوە بـۆ جیهـانێکی تـر، بە چاوی نیوەنووقاوەوە گوێم لێ ئەگرت، دیمەنـی ئاشـنای ڕازاوە ئەهـاتەوە خەیـاڵم کە لە منـاڵییەوە لەیـادم بـوون: تاوێـــک پەڵە هەوری شـــینی دووکەڵاوی بەهـــار بە ئاسـمانی چادرەکانـدا مەلە ئەکـات و تاوێک ڕەوەئەسـپ بەغار بەسـەر زەویـی نەرما بەرەو لەوەڕگاکان ئەڕۆن،

یـان جوانـوو و نۆمـا[32] بە یـاڵە درێژەکانیـان و ئـاگری فراوانـــی ڕەش لە چاوەکانیانـــدا کە بەلەخۆبـاییبوونەوە پـێش ئەسـپەکان ئەکەوتـن، یـان ڕانەمەڕ کە بەهێمنـی بەســەر لـوتکەی تەپۆلکەکـانەوە وەکـوو خۆڵەمێشـی گرکـان بـڵاو ئەبـوونەوە، یـان قەڵـبەزەی ئاوێـک بەسـەر ڕکەی تاوێرێکـا دێـتە خــوارەوە و کەفە سـپییەکەی سـۆمای چـاو ئەبـات، یـان ڕۆژکـاتی ئـاوابوون هێـواش ئەنیشـــێتە گیابەنـــدەکەی ئەوبەر چەمەوە، یـــان تـــاکە ئەسپسوارێک لە هێڵی داگیرساوی ئاسۆدا دیارە وەکوو نیشـتبێتە سـەر خۆر، تەنیـا ئەیەوێت دەسـت هەڵبڕێ و بیگرێـت... دوای ئەوە ئەویـش لە گیابەنـد و ژیلەمـۆی خۆرئاوابووندا ئەتوێتەوە.

دەشـــتی کـــازاخ لەوبەر چەمەوە فـــراوانە، هەردوو زنجیرەچیاکەی جیا کردۆتەوە بۆ ئەوەی ژوورێک بۆ خـۆی دروســت بکـات و ڕەق و چـۆڵ لە نێوانیانـــدا ڕاکشێت.

یەکەم هاوینی لەیادنەچووی جەنگ، ئاگر لە دەشـتەکە بەر بوو. ڕەوەئەسپی سوارەی سەربازی؛ ئاسمانەکەیان بە هەوری تەپوتـۆزی گەرم داگیـر کـرد، سـوارەکان بە هەموو لایەکدا غاریان ئەکرد. لەیادمە سوارێکی کازاخیم بینـی بە درێژیـی کەنـاری ئەوبەری ڕووبـارەکە غـاری ئەکرد و بە دەنگێکی گڕی وەکوو دەنگی شوان هـاواری ئەکـرد: "کەرگیـزی! ئەسـپەکانتان زیـن کەن... وا دوژمـن

هات!" ئیتر لە هەوری تەپوتۆز و شەپۆلی هەوای گەرما دیار نەما.

هەموو کەسێک خۆی ئامادە کرد بۆ شەڕ: ڕاچەنینێکی مەزن و تـــووڕە لەگەڵ یەکەم هێـــزی ســـوارە لە شاخەکانەوە هاتە خوارەوە و بە شیو و دۆڵەکاندا بڵاو بـوونەوە، هەزاران ئـاوزەنگی چـوون بەیەکـدا، هەزاران هەرزەکـار خۆیـان هەڵـدایە سـەر زیـن، لە پێشـیانەوە ڕیزێک ئاڵای سـوور بەسـەر سوارە هەموو ڕەنگەکاندا ئەشەکایەوە، لە پێشەوە و لە دواوەش گەردەلوولی تۆز و خۆڵی سمی ئەسپەکان، گریان و ڕۆڕۆی پڕ شـانازیی ژنەکانیان و دایکەکانیان ترپەی دڵی خاک بـوو لێیـانئەدا. "ڕۆڵە، دەشـتەکان پشـتیوانتان بێـت! گیـانی جەنگـاوەر "ماناس"[٣٣]ی قارەمان بتانپارێزێت!"

یادەوەریی تاڵی ئەو ڕێگایـانەی پیاوان پیای ڕۆیشتن بۆ جەنگ، هەر وا ماوە.

گۆرانییەکانی دانیـار چاویـان کـردمەوە سـەبارەت بەم جیهانە زەمینییەی جوانی و لێقەومان. ئەم هەموو شتانە لەکوێ فێر بووە؟ لە کێی بیسـتوون؟ هەستم کرد تەنیا یەک کەس کە ســاڵانێکی زۆری تەرخـان کردبێـت بــۆ خۆشەویســـــتیی خـــــاک و نەتەوە و ئـــــازاری ئەم خۆشەویستییەی چەشتبێت، ئەتوانێ بەم جۆرە خۆشـی بوێت.

کە گۆرانیی ئەوت؛ خۆیم ئەبینی، کوڕێکی بچووک، بە ڕێچکەکانی دەشتەکەدا ئەخولێتەوە. لەوانەیە ئەو کاتە ئەم گۆرانییانەی دەربارەی شوێنی لەدایکبوونی لە ڕۆحیدا جێگیر بووبن، یان لەوانەیە ئەو کاتەی ڕێگا ئاگرینەکانی جەنگی ئەبڕی. گۆرانییەکانی وایان لێ ئەکردم ئەمویست بەدەما بکەوم و دەست بکەمە ملی خاک وەکوو کوڕێک ستایشی بکەم کە دەستم ئەگاتێ و ئەتوانم بەو جۆرە خۆشەویستیی خۆم دەرببڕم. دواتر هەستم کرد شتێکی تازە لە ناخما خەبەری بووەوە.

شتێک کە هیچ وشەیەکم نییە بۆی، بەڵام شتێک بوو نەئەبەزی، ئەویش ئەوە بوو ناچارم گوزارشت لە خۆم بکەم... بەڵێ، گوزارە لە خۆم. نەک تەنیا بۆ ئەوەی هەست بە دنیا بکەم، بەڵکوو بۆ ئەوەی کەسانی تر وا لێ بکەم بۆچوونەکانم، بیروباوەڕەکانم و هەستەکانم ببینن، جوانییەکانی خاکەکەمان بە خەڵک بڵێم، دروست وەکوو ئەوەی دانیار ئەتوانێ بیکات. هەناسەم لە خۆم ئەبڕی، لە ترس و لە خۆشیی شتێکی تەواو نەزانراو، بەڵام تا ئەو کاتە نەمئەزانی ئەو دەنگەی ژیان بانگم ئەکات؛ فڵچە و تابلۆیە.

هەمیشە حەزم لەوە بووە وێنە بکێشم، وێنەی کتێبەکانی قوتابخانەم کۆپی ئەکرد، برادەرەکانیشم ئەیانوت "جوانت کۆپی کردووە"، مامۆستاکان زۆر ستایشی وێنەکانی بڵاوکراوەی قوتابخانەیان ئەکردم

.که جەنگ هەڵگیرسا؛ براکانم بانگ کران بۆ سەربازی، وازم لە قوتابخانە هێنا و چووم لە هەرەوەزییەکە ئیش بکەم وەکوو هەموو هاوڕێکانی هاوتەمەنم، هیچم لەبیر نەما دەربارەی فلچە و ڕەسم و هەرگیز بیرم نەئەکردەوە جارێکی تر بگەڕێمەوە سەری، بەڵام گۆرانییەکانی دانیار ڕۆحیان شڵەقاندم، سەرم لێ شێوابوو، بەحەپەساوییەوە سەیری دنیام ئەکرد وەکوو یەکەم جارم بێت هەموو شتێک ببینم.

گۆڕانێکی گەورەش لەپڕ بەسەر جەمیلەدا هات، وەکوو ئەوەی هەرگیز ئەو دەمهەراشی و پێکەنینە بەردەوامە ئەو نەبووبێت، خەمێکی درەوشاوەی بەهاری بەری چاوە نیشتووەکانی گرت، بەردەوام بە درێژیی ئەو ڕێگایە بۆ وێستگەکە لە بیرکردنەوەدا ون ئەبوو، زەردەخەنەیەکی مەتەڵئاسای خەونئامێز ئەکەوتە سەر لێوەکانی و بە شتێک دڵخۆش ئەبوو تەنیا خۆی ئەیزانی چییە.

زۆر جار بە فەردەیەکی قورسەوە لە جێی خۆیدا ئەوەستا، لەپڕ ترسێکی نەزانراو دایئەگرت وەکوو لەسەر کەناری چەمێکی خوڕ وەستابێت و دوودڵ بێت بپەڕێتەوە یان نا. خۆی لە دانیار دوور ئەخستەوە و ڕاستەوخۆ سەیری دەموچاوی نەئەکرد.

جارێکیان لەسەر خەرمانەکە، جەمیلە بەبێزارییەوە وتی: "ئەو کراسە داکەنە، با بۆت بشۆم."

دوای ئەوەی کراسەکەی لە چەمەکە شۆرد؛ هەڵیخستەوە وشک بێتەوە، لە پاڵیا دانیشت و بەدڵ دەستی پیا ئەهێنا و چرچەکانی دەرئەکرد و ئەیدایە بەر هەتاوەکە شانە دڕاوەکانی ببینێت، سەری ڕاوەشاند و بەخەفەتەوە دەستی ئەکردەوە بە سافکردنی.

لەو ماوەیەدا جەمیلە تەنیا جارێک وەکوو جاران بە دەنگی بەرز و بێپەردە پێکەنی و چاوەکانی گەشانەوە. ڕۆژێک کۆمەڵێک ژنی کەم تەمەن و کچانی عازەب و گەنجانی پێکراوی جەنگ کە لە مەڵۆکردنی وێنجە ئەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە، لایان دایە سەر خەرمانەکە.

"هێی خواپێداوەکان، نابێ هەر ئێوە نانی گەنمی سپی بخۆن! بەشی ئێمەش بدەن، ئەگینا فڕێتان ئەدەینە چەمەکەوە!" گەنجەکان هاواریان ئەکرد و سێڵکەکانیان[٣٤] بە شۆخی و هەڕەشەوە با ئەدا.

"لێتان ناترسین! نان بۆ ئافرەتەکان پەیدا ئەکەین، بەڵام ئێوە ئەبێت خۆتان نانی خۆتان پەیدا بکەن!" جەمیلە بە دەنگێکی ئاشکرا پێی وتن.

"مادام وایە، ئێستا هەمووتان فڕێ ئەدەینە ئاوەکە!"

گەنجەکان و کچەکان ئامبازی یەک بوون، هاواریان ئەکرد، ئەیانقیژاند و پێئەکەنین و هەریەکەیان پاڵی بەوی ترەوە ئەنا بیخاتە ئاوەکە.

"بیانگرن! ڕایانکێشن!" جەمیلە پێئەکەنی و بە دەنگی بەرزتر لە هەمووان ئەیقیژاند، زیرەکانە خۆی لە دەستی هێرشبەرەکان دەرباز ئەکرد.

سەیر بوو، هەرزەکارەکان هەر چاویان لەسەر جەمیلە بوو، هەر کەسێک ئەیویست بیگرێت و بینوسێنێت بە خۆیەوە! لەپڕ سێ گەنج گرتیان و هەڵیانگرت بەرەو کەنارەکە.

"ماچمان کە، یان فڕێت ئەدەینە ئاوەکەوە!"

"وەرن با مەشکەژەنێی پێ بکەین!"

جەمیلە خۆی با ئەدا لەدەستیان ڕزگار بێت و قاقای لێئەدا و بانگی کچەکانی هاوڕێی ئەکرد فریای کەون، بەڵام ئەوان بەسەر کەنارەکەدا لەمسەرەوە بۆ ئەوسەر ڕایانئەکرد و لەچکەکانیان لە ئاوەکە دەرئەهێنایەوە. جەمیلە بەدەم خۆشی و پێکەنینی گەنجەکانەوە بەرەو ئاوەکە هەڵدرا.

جەمیلە بە قژی تەڕ و پەخشانەوە لە ئاوەکە هاتە دەرەوە، لە هەموو کاتێک جوانتر، کراسە تەڕە تەنکەکەی بە لەشیەوە نوسابوو، سمتە خڕە توند و مەمکۆڵە ئارەزووبزوێنەکانی دەرکەوتبوون، بەڵام ئەو گوێی نەئەدایە هیچ و پێئەکەنی، خۆی ڕائەوەشاند و سەری بە پاش و پێشدا ئەخست و دەزوولەی ئاو لە دەموچاوە سوورهەڵگەڕاوەکەی ئەچۆڕا.

"ماچمـــان كه!" گەنجەكـــان ســـوور بـــوون لەســـەر داواكەيان.

جەميلە ماچى كردن، بەڵام دووبارە خۆى فڕێ دايەوە ئـــاوەكە و پێئەكەنـــى و پەلـــكە قورســـەكانى ســـەر دەموچاوى ئەخست بە پشتا.

هەموو ئەوانەى لەسەر خەرمانەكە بوون، بە گەمەى لاوەكـان پێئەكەنـين. بەتەمەنەكـان شـەنەكانى دەسـتيان فـڕێ ئەدا و فرمێسـكەكانى چاويـان ئەسـڕى. چـرچە ئەسـمەرەكانى دەموچاويـان لە خۆشـى و گەڕانەوەى گەنجيى بۆ مـاوەيەكى كەم، ئەبريسكانەوە. منـيش زۆر بە دڵ پێكەنيم و بۆ جارێك ئەركى پاراستنى جەميلەم لە هەتيو و مەتيو لەبير كرد.

بەتەنيا دانيار بێدەنگ بوو، لەپڕ هەستم پێ كرد و منـيش وەسـتام. لە سـووچێكى خەرمـانەكەدا بەتەنيـا وەستابوو و قاچەكانى بڵاو كردبووەوە، وا ئەهاتە بەر چاوم خۆى ئامادە كردووە ڕابكات و جەميلە لەدەست گەنجەكان ڕزگار بكات. چاوى لەسـەر هەڵنەئەگرت، بە پێناخۆشـــى و پێسەرســـامييەوە ســـەيرى ئەكـــرد، لە ڕوانينەكەيدا هەم ئازار و هەم خۆشحاڵى ديار بوو.

بەڵـــێ، جەمـــيلە لە هەمـــان كاتـــدا هەم ســـەرچاوەى خۆشـــحاڵى و هەم نەهـــامەتى بـــوو. كـــاتێ گەنجەكـــان باوەشـيان پيـا ئەكـرد و ناچاريـان ئەكـرد يەک لەدواى

یەک ماچیان بکات، سەری دائەنەواند و وەکوو بیەوێت بڕوات، بەڵام نەئەڕۆیشت.

هەمان کات جەمیلەش هەستی بەو کرد، لەپڕ لە پێکەنین وەستا و سەری بەرز کردەوە.

"ئیتر یاری بێعەقڵانە بەسە!" گەنجە بزێوەکانی دوور خستەوە.

یەکێک لە گەنجەکان ویستی دەست بکاتە ملی. "لا چۆ!" پاڵێکی پێوە نا. بەدزییەوە سەیرێکی دانیاری کرد و ڕایکرد بۆ ناو زەبەندەکە جلەکانی داکەنێ و بیگوشێ.

زۆر شتی تر هەبوو لە پەیوەندییەکەیانا کە من تێی نەئەگەیشتم، پیاو ڕاستیش بڵێت ئەترسام بیری لێ بکەمەوە، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر خەفەتم ئەخوارد کە هەستم ئەکرد جەمیلە دڵتەنگە بەوەی خۆی لە دانیار ئەپارێزێت، پێم خۆشتر بوو وەکوو جاران بەدەمیەوە پێبکەنێ و گاڵتەی پێ بکات، بەڵام لە هەمان کاتدا کە شەوان ئەگەڕاینەوە بۆ ئاوایی؛ دەنگی گۆرانییەکانی دانیار ئەیانهەژاندم، لەگەڵ هەستێکی ناوەوە کە هەردووکیان دڵخۆشن.

کە بە دۆڵەکەدا ئەڕۆیشتین؛ جەمیلە عەرەبانەکەی لێئەخوڕی، بەڵام لەو دیوەوە لە دەشتەکەدا دائەبەزی و بەپێ ئەڕۆیشت و عەرەبانەکەی ڕائەکێشا، منیش هەر وام ئەکرد، چونکە خۆشتر بوو بەپێ بڕۆیت و گوێ

بگریت. له سەرەتاوە بەدوای یەکدا ئەڕۆیشتین، بەڵام لەپڕ، بێ ئەوەی ئاگامان لە خۆمان بێت، هێزێکی نادیار پاڵی پێوە ئەنایین لە دانیار نزیک بینەوە، ئەمانویست کاریگەریی وشەکان لەسەر ڕواڵەت و چاوەکانی ببینین. ڕاستە ئەم دەنگە، دانیاری گۆشەگیر و دڵتەنگ و بێدەنگە!

هەموو جارێ هەستم ئەکرد جەمیلە دڵی لەلایەتی و پێی سەرسامە، بەوەی دەستی بەرەو ڕووی بەرز ئەکردەوە، بەڵام ئەو نەیئەبینی، چونکە بۆ دوور ئەیڕوانی، دەستەکانی ئەخستە پشتی سەری و بەملاولادا بای ئەدا، ئیتر جەمیلە بێئومێدانە دەستی بە قەراغەکانی عەرەبانەکەدا شۆڕ ئەکردەوە، ئەیگێڕایەوە و لە جێی خۆیدا لەناوەڕاستی ڕێگاکەدا ئەوەستا و نەئەڕۆیشت، سەری دائەنەواند و شۆک ئەبوو، بە چاوەکانی دوای ئەکەوت و دەستی ئەکردەوە بە ڕۆیشتن.

هەندێ جار بیرم ئەکردەوە من و جەمیلە هەستێکی هاوبەشی یەکسانی ناخۆش بێتاقەتمان ئەکات، لەوانەیە ئەم هەستە دەمێک بێت لە ڕۆحماندا شاراوەیە و ئێستا کات و ساتی ئاشکراکردنیەتی.

جەمیلە هێشتا ئەیتوانی تەواو خۆی تەرخان بکات بۆ کارکردن، بەڵام لە کاتە تایبەتەکانی پشوودان کاتێک ئێمە لەسەر خەرمانەکە چاوەڕوانین؛ ئەو پشووی

نەئەدا، ئەچــووە لای شــەنکەرەکان ئەوەســتا و هەنــدێ جــار یــارمەتیی ئەدان و چەنــد شــەنێک گەنمــی بەرز هەڵئەدا بە ئاسمانا، بە ئاسانی و کارامەیی بەبای ئەکرد، دوای ئەوە شــەنەکەی دائەنــا و ئەچــوو بــۆ لای کــۆمەڵە سرووتێک و لە سێبەرەکەیدا دائەنیشت. وەکوو ئەوەی نەوێرێـت بەتەنیــا بێـت، بــانگی ئەکــردم: "وەرە بــۆ لام شووبرا، با تاوێک بەیەکەوە دانیشین!"

من هەمیشە پێشبینیم ئەکرد هەندێ شتی گرنگم پێ بڵێ و بۆم ڕوون بکاتەوە چی نیگەرانی کردووە، بەڵام هیچی نەئەوت، بێدەنگ سەری ئەخستمە سەر ڕانی و چاوی ئەبڕییە شوێنێکی دوور و دەستی ئەهێنا بە قژە بژەکەمدا و لەسەرخۆ دەموچاومی بە دەستە لەرزۆک و گەرمەکانی ئەسڕی، لە ژێرەوە سەیرم ئەکرد، سەیری دەموچــاوە پــڕ نیگەرانــی و تــامەزرۆییەکەی و وا دیــار بوو خۆمم تیا ئەبینی، شتێک لە ناخیا چەکەرەی ئەکرد و سەوز ئەبوو و پێئەگەیشت، داوای دەروویەکی ئەکرد لێوەی ئاشکرا بێت، ئەویش لەوە ئەترسا، بەئـازارەوە حەزی لێ ئەکرد و هەر بەئازارەوە نەیئەویست دانی پیا بنێت عاشقە، وەک چۆن منیش ئەمویست و نەمئەویست دانیاری خۆش بوێت، هەر چۆنێک بێت بووکی دایک و باوکمە و براژنمە.

ئەو جــۆرە بیــرانە بە مێشــکما ڕائەبــوردن، منــیش لە مێشکمم دەرئەکردن. گەورەترین حەزم ئەوە بوو لێوە

تەنکەکانی ببینم تا نیوە ئەکرێنەوە وەکوو لێوی مناڵ، لەگەڵ چاوە فرمێسک تیا قەتیسماوەکانی. چەند دڵنشین بوو! چەند جوان بوو! دەموچاوی چەند ئیلهامبەخش و سۆزبەخش بوو! هەستم بەمانە بە هەموویان ئەکرد، بەڵام لەو کاتەدا لێی تێنەئەگەیشتم، هەتا ئێستاش هەندێ جار لە خۆم ئەپرسم: لەوانەیە خۆشەویستی ئیلهام ببەخشێ وەکوو ئەوەی بۆ هونەرمەندێک یان شاعیرێک بەدی دێت. سەیری جەمیلەم ئەکرد، ئەمویست ڕاکەم بۆ دەشتەکە و هاوار بکەم بۆ ئەرز و ئاسمان، داوایان لێ بکەم چی بکەم بۆ ئەوی زاڵ بم بەسەر ئەو خۆشی و نیگەرانییە نامۆیەی داگیری کردووم. وا بزانم جارێک وەڵامم دەست کەوت.

وەک هەمیشە، کاتێک لە ویستگەکە ئەگەڕاینەوە؛ شەو تاریکی کردبوو، ئەستێرەکان ئەتوت پورەهەنگن بە ئاسمانەوە، دەشتەکە خەریک بوو ئەنوست، تەنیا دەنگی دانیار ئەو بێدەنگییەی ئەشڵەقاند، وردە وردە لە تاریکییە دوورەکەدا ئەتوایەوە و من و جەمیلەش لە دوایەوە ئەڕۆیشتین.

نازانم ئەو شەوە دانیار چیی بەسەر هاتبوو! ئەوەندە سۆزی دووری و ئاوازێکی قووڵی داخی تەنیایی لە دەنگیا بوو، فرمێسکی هاوسۆزی و بەزەیی بە چاوتا ئەهێنایە خوارەوە. جەمیلە سەری دانەواندبوو، بەتەنیشت عەرەبانەکەی دانیارەوە ئەڕۆیشت، بەتوندی

دەستی بە قەراغەکەیەوە گرتبوو، کە دانیار دەنگی هەڵبڕی؛ جەمیلە سەری بەرز کردەوە و بەدەم ڕۆیشتنەوە خۆی هەڵدایە سەر عەرەبانەکە و لە تەنیشتیەوە دانیشت. وەکوو لە بەرد دروست کرابێت، دەستەکانی لەسەر سنگی گرێ دابوو. لە تەنیشتیانەوە ئەڕۆیشتم، تۆزێ پەلەم کرد بزانم چی ڕوو ئەدا. دانیار بەردەوام بوو لە گۆرانیوتن و هیچ بایەخی بە جەمیلە نەدا. بینیم چۆن دەستەکانی شل کردەوە و بەری دان، خۆی نوساند بە دانیارەوە و سەری خستە سەر شانی، بۆ چرکەیەک دەنگی دانیار لەرەیەکی تێ کەوت وەکوو ئەسپێک لە لێدانی قامچییەک دائەچڵەکێ. بۆ ئەوەی دەنگی لە پێشتر بەرزتر بێتەوە، گۆرانییەکی دڵداریی ئەوت!

تووشی گەشکە بووم، وەکوو دەشتەکە گوڵی گرتبێ؛ تاریکییەکە ڕەوییەوە و ئەو ناوە ڕووناک بووەوە و دوو عاشقم لە پانتاییەکەیدا ئەبینی، منیان نەئەبینی، من هەر نەبووم. لە تەنیشتیانەوە ئەڕۆیشتم، چاودێریم ئەکردن، بە ئاوازی گۆرانییەکەوە خۆیان ڕائەژەند، هەموو شتێک لە دنیادا لام ڕوون بوو، بەڵام ئەوانم نەئەناسی.

هەر ئەو دانیارەی ئەوسا بوو بە کراسە عەسکەرییە دڕاوە سنگ کراوەکەیەوە، بەڵام چاوەکانی لە تاریکییەکەدا ئەبریسکانەوە، جەمیلەکەی من خۆی پێوە

نوساندبوو، بێدەنگ و شـەرمن لەگەڵ وردەفرمێسک بە برژانگەکـــــانیەوە ئەبریســــکانەوە. دوو کەســـــی تـازەلەدایکبوو بـوون، کامەرانییەکەیـان پێشـتر بـوونی نەبـووە. ئەی ئەمە کـامەرانی نیـیە؟ ئەی دانیـار نەبـوو هەمـــوو خۆشەویســـتییە مەزنەکەی بـــۆ شـــوێنی لەدایکبـــوونی، ئەو شـــوێنەی ســـەرچاوەی ئەم هەمـــوو ئاوازە ڕۆحهەژێنە بوو، بۆ جەمیلە ئەگێڕایەوە؟ بەڵێ، گۆرانیی بۆ ئەو ئەوت، گۆرانیی لە پێناوی ئەوا ئەوت.

جـــارێکی تـــر ئەو سەرســـامبوونە نـــامۆیە بەو گۆرانییـانەی دانیـار لە ناخمـدا سـەری هەڵدایەوە، لەپڕ تێگەیشتم چیم ئەویست، ئەمویست وێنەیان بکێشـم. لەم بیرۆکەیەی خۆم ترسـام، بەڵام ئارەزووم لە ترسـەکەم بەهێزتر بوو. ڕێک وەکوو خۆیان وێنەیان ئەکێشم کە لە کامەرانیدا مەستن! بەڵێ، ڕێـک وەک چـۆن دواییش وا ئەبن! بەڵام ئایـا ئەتـوانم ئەوە بـکەم؟ تـرس و خۆشـی هەناسەیان لێ بڕیم. کە ئەڕۆیشتم، وەکوو هۆشـم لای خۆم نەبێت؛ منیش کامەران بووم، چونکە نەمئەزانی ئەم ئارەزووە سەرشێتانەیە لە پاشەڕۆژدا چەند کێشـەم بۆ دروســت ئەکـات. بە خـۆمم ئەوت مـرۆڤ ئەبێـت بەو جـۆرە زەوی ببینێـت کە دانیـار بینیـویەتی، مـن ڕەنـگ بەکار دێنم بۆ وتنی گۆرانییەکەی ئەو. منیش زنجیرە چیـا و دەشـتایی و خەڵـک و گیـا و هەور و ڕووبـارم ئەبێت. بیرۆکەکە لە مێشکما چەسپا، بەڵام بۆیەم لەکوێ

بـوو؟ لە قوتابخـانە وەرمـاننەگرتووە، چـونکە خۆیـان ئەیانویست! وەکوو ئەوە کێشەی سەرەکییان بێت!

لەپڕ دانیـار گۆرانییەکەی بڕی، جەمـیلە سەرکێشـانە دەسـتی کردە ملـی و دەسـتبەجێ بەری دا، هەناسـەیەک لە جێی خۆیدا ڕەق بوو، دوور کەوتەوە و خۆی هەڵدایە خـوارەوە. دانیـار بەدوودڵـیـیەوە لغـاوەکەی ڕاکێشـا و ئەسپەکان وەستان، جەمیلە لەسـەر جادەکە وەسـتابوو، پشتی لەو بوو، سەری خست بە پشـتا و بە تیلەی چاو سەیری کرد، بە چاوی فرمێسکاوییەوە وتـی: "سـەیری چـی ئەکەیـت؟" دوای وەسـتانێک بەتـووڕەیی وتـی: "سەیری من نەکەیت، لێخوڕە، بڕۆ!" سەر کەوتەوە سەر عەرەبـانەکەی خـۆی. "ئەی تـۆ سـەیری چـی ئەکەیـت؟" قیژانـدی بەسـەرما: "سـەر کەوە و جـڵەوەکەت بگـرە! عەمرتان نەمێنێ!"

"لەپـڕ بـۆ وای لـێ هـات!" سـەرم سـوڕما، ژەنـدم لە ئەسـپەکانەوە. گـران نەبـوو بزانیـت بـۆ وای کـرد: سەرزەنشـتی خـۆی کـرد، ئـافرەتێکە مێـردی هەیە و هێشتا زیندووە و لە نەخۆشخانەی ساراتوڤ کەوتووە. مـن ڕقـم لە خۆیشـم و لەویش بـوو. لەوانەیە بەڕاسـتی ڕقـم لە جەمـیلە بێت، ئەگەر بـزانم دانیـار ئیتـر گـۆرانی ناڵێت و جارێکی تر گوێم لە دەنگی نابێتەوە.

هەمـوو گیـانم ئەیەشـا، خـۆم نەئەگـرت، پەلەم بـوو بگەڕێـمەوە و لەسـەر سـرووتەکە بـکەوم. پشـتی

ئەسپەکان لە تاریکییەکەدا ئەجوولان و عەرەبانەکەش ئەوەنە هەڵبەزودابەزی ئەکرد؛ تەحەمول نەئەکرا، لغاوەکە بەرە بەرە لە دەستم ئەخزا و شل ئەبووەوە.

لەسەر خەرمانەکە جڵەوەکانم لە ئەسپەکان گرتەوە و فڕێم دانە ژێر عەرەبانەکە، هەر گەیشتمە سەر شاراکان؛ خۆم دا بەسەر سرووتەکەدا، ئەم جارەیان دانیار ئەسپەکانی برد بۆ لەوەڕگاکە.

ڕۆژی دوایی بەیانی هەستام دڵم خۆش بوو، وێنەی جەمیلە و دانیار ئەکێشم. چاوم نووقاند و توند گوشیم، هاتە خەیاڵم چۆن ڕەسمیان ئەکەم. تەنیا بۆیە و فڵچەم مابوو دەست پێ بکەم.

ڕامکرد بۆ سەر چەمەکە و دەموچاوم شۆرد و ڕامکرد بۆ لای ئەسپە بەستراوەکان، وێنجە تەڕەکە پێیە پەتییەکانیان ئەکوتام و چزەیان لە بنی پێ قڵیشاوەکانم هەڵئەستاند، بەڵام زۆرم پێ خۆش بوو. کە ڕامئەکرد، تێبینیی هەموو وردەکارییەکم ئەکرد لەدەورم ڕوو ئەدات.

ڕۆژ لە چیاکانەوە هەڵئەهات، گوڵەبەڕۆژەیەک کە بەڕێکەوت لە گوێی جۆگەیەکی ئاودێری ڕوابوو؛ ڕووی تێ کردبوو و چاوبازە و کەرتەشی دەورەیان دابوو، بەڵام قنج وەستابوو، تیشکی خۆری بەیانی ئەخواردەوە

و به زمـــانه زەردەکـــانی هەڵێئەمــژین و دەرخـــواردی سەلکە قورسە پڕ دەنکەکەی ئەدا.

لەو شوێنانەی پێچکەی عەرەبانەکان لەسەر قوڕەکە لە کـاتی پەڕیـنەوە لە چەمەکە چاڵیـان کردبـوو؛ ئـاو ئەیگەیشـتێ، دوورگەیەکــی بۆنخۆشــی وەنەوشـــە و پونگەی باڵابەرزی ئاو ئەدا.

ئەوا مــن بە ســەرزەمینی لەدایکبوونمــدا ڕائەکەم و پەڕەسێلکەیەک بەسەر سەرمەوە ئەفڕێت و پێشبڕکێم لەگەڵدا ئەکات... ئاخ! خۆزگە بۆیەم لەبەر دەستا ئەبوو، وێـنەی ئەو خـۆری بەیـانییەم ئەکێشـا، شـاخە شـینە سپیواشـــەکان[٣٥]، وێــنجە تەڕەکــان، لەگەڵ ئەو چــڵە گوڵەبەڕۆژە تاقانەیەش کە لەسەر کەناری جۆگەلەکە ڕواوە.

کە گەڕامەوە جێ خەرمانەکە، یەکسەر ئەو خۆشییەم لێ شێوا. جەمیلەم بینی، ڕووگرژ و بێتاقەت، ئەڵقەی ڕەش دەوری چاوەکانی دابوو، لەوە ئەچوو دوێنێ شەو نەخەوتبێ.

نە بزەی بۆ کردم و نە قسەی لەگەڵ کردم، بەڵام کە ئوروزمـات هـات؛ جەمـیلە چـوو بـۆ لای و پێـی وت: "عەرەبـانە کـۆنەکەتم لـێ وەرگـرەوە، بـۆ کوێـت ئەوێ بمنێـرە، بەڵام ئیتـر نامەوێـت گەنـم بگـوێزمەوە بـۆ وێستگەکە!"

"مەسەلە چییە، کچی؟ مێشئەسپ پێوەی داوی؟" بە سەرسوڕمان و تەوسەوە پێی وت: "مێشئەسپ ئەدا بە گوێرەکەوە! لێم مەپرسە بۆچی، پێم وتی ناچم و بڕایەوە!" زەردەخەنە لەسەر ڕووی ئوروزمات نەما.

"هەقم نییە تۆ چیت ئەوێ، ئەبێ لەسەر کاری خۆت بمێنیت!" دارشەقەکەی کوتایە زەوی: "ئەگەر کەسێک بێتاقەتی کردووی؛ پێم بڵێ، ئەم دارشەقە لە سەر و گوێلاکیا ئەشکێنم! ئەگەر کەسیش نییە، ئیتر ئەم قسە پووچانە مەکە. ئەوە نانی سەربازەکانمانە ئەیگوێزیتەوە، مێردەکەی خۆیشت یەکێکە لەوان!" بەتووڕەییەوە ڕووی وەرگێڕا و بەشەلەشەل ڕۆیشت.

جەمیلە پێی ناخۆش بوو، هەناسەیەکی هەڵکێشا، لە تەوقی سەریەوە تا بەری پێی سوور هەڵگەڕا کە سەیری دانیاری کرد. دانیار تۆزێ دوور وەستابوو، پشتی لەم بوو، بەتووڕەییەوە تەنگەی[٣٦] ئەسپەکانی توند ئەکرد، گوێی لە هەموو قسەکان بوو. تا تۆزێک جەمیلە لە شوێنەکەی خۆیدا وەستا؛ یاریی بە قامچییەکە ئەکرد، جووڵەیەکی نارەزایی بە دەستەکانی نیشان دا و چوو بۆ لای عەرەبانەکەی.

ئەو ڕۆژە زووتر لە ڕۆژەکانی تر هاتینەوە، دانیار بە درێژیی ڕێگا ئەسپەکانی تاو ئەدا، جەمیلە بێدەنگ و ڕووگرژ بوو، لە کاتێکا من بڕوام نەئەکرد دەشتەکەی بەر چاوم سووتاو و ڕەشە، ئەی بۆ تەنیا دوێنێ

ڕەنگێکی تر بوو! وەکوو لە چیرۆکێکی بەرئاگرداندا بیستبێتم، ئەو چیرۆکی کامەرانییەی هەستی بێدار کردمەوە؛ بۆ هەناسەیەکیش بەجێی نەئەهێشتم، لایەنە درەوشاوەکەی ژیانم دۆزییەوە، لە خەیاڵی خۆما بە هەموو وردەکارییەکانیەوە دروستم ئەکردەوە، تا بەتەنیا ئەوە بوو بە بیرکردنەوەی هەمیشەم. ئارامم نەگرت، تا پارچەیەک کاغەزی ئەستووری سپیم لە کارمەندی سەرقەپانەکە دزی. ڕامکرد و خۆم لەپشت شارایەک سرووتەوە شاردەوە. لەوێ کە دڵم لەبەر بینمدا لێیئەدا، خستمە سەر پارچەیەک تەختەی سفت کە هی دەمی ڕەنەرێک[٣٧] بوو لە ڕێگا دۆزیبوومەوە.

"بە بەرەکەتی خوا!" لە دڵی خۆما وتم وەک یەکەم جار باوکم سواری ئەسپی کردم، وای وت. دواتر قەڵەمەکەم بەسەر کاغەزەکەدا هێنا، ئەوە یەکەم هێڵکاریم بوو بۆ قوتابخانەی نەکەم. کە وێنەی دەموچاوی دانیار لەسەر کاغەزەکە دەرکەوت، هەموو شتێکی ترم لەبیر چووەوە.

لە خەیاڵی خۆما دەشتە هاوینییەکەم دی لە شەودا، هەر بە خەیاڵ گوێم لە گۆرانییەکەی دانیار بوو، بینیم سەری خستووە بەپشتا و قورتمی بەڕووتی دەرکەوتووە. جەمیلەم بینی سەری خستۆتە سەر شانی. عەرەبانەیەکە و هەردووکیان بەیەکەوە سوار بوون، لغاوەکە شل کراوەتەوە و فڕێ دراوەتە سەر

پێشی عەرەبانەکە، پشتی ئەسپەکان لە تاریکییەکەدا ئەهەژێن. لەوانیش بەدەر، تا چاو بڕ بکات دەشتەکەیە و لە دووریشەوە ئاسمان و ئەستێرەیە.

وا چووبوومە ناو وێنەکێشانەکەوە؛ گوێم لە هیچ نەبوو لەدەوری خۆم، کە گوێم لە دەنگی یەکێک بوو بەسەر سەرمەوە وەستاوە؛ داچڵەکیم.

"ئەوە تۆ کەریت؟"

جەمیلە بوو، من شڵەژام و سوور بوومەوە، فریای ئەوە نەکەوتم وێنەکە بشارمەوە.

"عەرەبانەکانمان بار کردووە، یەک سەعاتە بانگت ئەکەین! ئەوە چی ئەکەیت لێرە؟ ئەوە چییە؟" لێی پرسیم، ڕەسمەکەی هەڵگرت. "ئممم!" بەتووڕەییەوە شانی کووڕ کرد.

حەزم ئەکرد بمردمایە. زۆر زۆر سەیری وێنەکەی کرد، دواتر سەری هەڵبڕی و بە خەفەت و چاوی تەڕەوە سەیری منی کرد.

"بیدە بە من شووبرا، بۆ یادگاری ئەیشارمەوە." بەهێمنی پێی وتم. وەرەقەکەی دووقەد کرد و خستیە باخەڵی.

دوای ئەوە کەوتینە ڕێ، نەمئەتوانی بێمەوە هۆش خۆم، وەکوو ئەوەی هەمووی خەو بێت، بڕوام نەئەکرد

وێنەیەکم کردبێت ئەوە نیشـان بدات کە بینیبووم، بەڵام لە قووڵایی دڵما هەستێکی سروشتیی سەرکەوتن، بگرە شـانازییش گەشـەی ئەکـرد. خەونەکـانم هەر یەکێکیـان لەوی تر ئازایانەتر بوو، هەریەکەیان لەوەی دوای خۆی هەستبزوێنەرتر، مێشکمیان خستە مەلە. ئێستا ئەمەوێت زۆر ڕەسـمی تـر بـکەم بە بـۆیە، نەک بە قەڵەم، گـوێم نەئەدایە ئەوەی چەنـد بەپەلە لێئەخـوڕین. ئەوە دانیـار بوو ئەسپەکانی تاو ئەدا. جەمیلە دوا نەئەکەوت، سەیری ئەمبەرەوبەری ئەکرد، جارجاریش پێئەکەنی، پێکەنینێک هەسـتکردن بە تاوانبـاریی پێـوە دیـار بـوو، منـیش جارجارێک زەردەخەنەم ئەکرد، چونکە دیارە ئیتر لێمان تـووڕە نییە. ئەگەر داواشـی لـێ بکـردایە، ئەو ئێـوارەیە دانیار گۆرانیی ئەوت.

ئەو ئێـوارەیە زۆر زووتـر لە کـاتی خـۆی گەیشـتینە وێستگەکە، ئەسپەکانمان کەفیان هەڵخستبوو.

ئێمە هێشـتا عەرەبانەکانمـان نەوەسـتاندبوو کە دانیـار دەستی کرد بە بەتاڵکردن. بۆ وا ئەکات؟ بۆچی ئەوەندە پەلەیەتـــی؟ جارجارێـــک ئەوەســـتا و بە تێڕامـــان و بیرکردنەوەوە ئەیڕوانییە ئەو شـەمەندەفەرانەی وەکوو برووسـکە تێـئەپەڕین. جەمـیلەش بە هەمـان ئاراسـتە ئەیڕوانی، وەکوو بیەوێت تێبگات بیر لە چی ئەکاتەوە.

"ئا وەرە، ناڵی ئەو ئەسپە شل بۆتەوە، یارمەتیم بدە لێی بکەینەوە!" جەمیلە بـانگی کـرد. دوای ئەوەی سمی

ولاخەکەی خستە بەینی ئەژنۆکانی و ناڵەکەی لێ کردەوە؛ ڕاست بووەوە، جەمیلە سەیری چاوەکانی کرد و بەناسکی پێی وت: "ئەوە چییە؟ تۆ عەقڵت نییە؟ یان وا ئەزانی دنیا ئافرەتێکی تری تیا نییە من نەبێت؟"

دانیار ڕووی وەرگێڕا و هیچی نەوت.

"وا ئەزانیت ئەوە بۆ من ئاساییە؟" جەمیلە هەناسەیەکی هەڵکێشا.

دانیار برۆکانی هێنایەوە یەک، بە خۆشویستن و خەفەتەوە بەهێمنی وەلامی دایەوە، من گوێم لێ نەبوو چیی وت، بەپەلە چووەوە بۆ لای عەرەبانەکەی، جۆرێک دڵی خۆش بوو؛ بەدەم ڕێوە یاریی بە ناڵەکە ئەکرد.

وشەکانی جەمیلە چی دڵنەواییەکی تیا بوو؟

ئەبێ چی دڵنەواییەکی تیا بێت بۆ کەسێک ئەگەر یەکێک هەناسەیەکی قووڵ هەڵکێشێت و بڵێ: "تۆ وا ئەزانی ئەوە بۆ من ئاساییە؟"

بارەکانمان بەتاڵ کردبوو، ئەمانویست بگەڕێینەوە، سەربازێکی برینداری لاواز؛ پاڵتۆیەکی چرچی لەبەرا بوو، توورەکەیەکی کەلوپەلی دابوو بە شانیا، خۆی کرد بە گۆڕەپانەکەدا. شەمەندەفەرەکە چەند دەقیقەیەک پێشتر وەستابوو، سەربازەکە سەیری دەوری خۆی کرد و هاواری کرد: "کەس لێرە خەڵکی گوندی کورکۆریۆیە؟"

"مــن خەڵكــی كوركۆریــۆم." وەڵامــم دایەوە، ســەرم سوڕمابوو ئەبێ ئەم كابرایە كێ بێت!

"تۆ كوڕی كێیت؟" ســەربازەكە پرسـیی. بەرەو ڕووم هات، لەناكاو جەمیلەی دی، سـەری سـوڕما و خۆشـیی لەسەر دەموچاوی دەركەوت.

"كەریم، ئەوە تۆی؟" هاواری كرد.

"جەمیلە گیان!" هاواری كرد و توند دەستی لە دەستیا گوشی.

دەركەوت خەڵكی یەک گوندن.

"چی شانسێكە! بێگومان شانسە كە من هاتم سەر لەم وێستگەیە بدەم!" بەسەرسوڕمانەوە وتی: "من ئێستا لای سادقەوە هاتووم، لە نەخۆشخانە بەیەكەوە بووین، خوا ڕەحم بكات، مانگێک یان دووانی تر دەرئەچێت. كە من خەریک بوو دەرئەچووم؛ پێم وت نامەیەک بۆ ژنەكەت بنووسە، بەڵێن بێت بیگەیەنم. ئا ئەوەتا، ئیمزا كراوە و داخراوە." كەریم زەرفێكی سێگۆشەی دایە دەستی.

جەمیلە پڕی پیا كرد، دەموچاوی سوور هەڵگەڕا، ئینجا سپی بوو، بەدزییەوە بە تیلەی چاو سـەیرێكی گومانـاویی دانیـاری كـرد. دانیـار لەپـاڵ عەرەبانەكەیـدا وەسـتابوو، وەک چـۆن ئەو ڕۆژە لەسـەر خەرمـانەكە تەنیـا كەس بـوو لەپـاڵ عەرەبانەكەیـدا وەسـتابوو، كە

ڕاستەوخۆ سەیری جەمیلەی ئەکرد؛ چاوەکانی پڕ ئەبوون لە نائومێدی.

دوای ئەوە خەڵکەکە لە هەموو لایەکەوە دەورەیان دا، سەربازەکە لەناو قەرەباڵغییەکەدا هاوڕێ و خزمی خۆی دۆزییەوە، بە پرسیار دایانگرتەوە. پێش ئەوەی جەمیلە بواری ئەوەی بێت سوپاسی بکات بۆ نامەکە؛ عەرەبانەکەی دانیار تیژ دای بەلایدا، بە هەڵبەزودابەز بە ڕێگا پڕ لە چاڵوچۆڵەکەدا لە گۆڕەپانەکە دەرچوو، هەورێک تەپوتۆزی بەرپا کرد.

"ئەم کابرایە شێت بووە!" خەڵکەکە هاواریان کرد.

خەڵکەکە سەربازەکەیان برد بۆ شوێنێک. کاتێک من و جەمیلە لەناوەڕاستی گۆڕەپانەکەدا وەستابووین، سەیری تەپۆتۆزەکەمان ئەکرد کە بەخێرایی بڵاو ئەبووەوە.

"وەرە براژن، با بڕۆین!"

"تۆ بڕۆ، بەجێم بێڵە!" بەماتەمەوە وتی.

ئەوە یەکەم جار بوو هەریەکەمان بەتەنیا بگەڕێینەوە. گەرما و گڕەکە لێوی هەڵقرچاندبووم، زەوییە سووتاوە قڵیشاوەکە کە بە گەرمای ڕۆژ ڕەنگی خۆڵەکەی سپی بووبوو؛ سارد ئەبووەوە و ڕەنگی خۆڵەکەی ئەگۆڕا بۆ خۆڵەمێشییەکی وەکوو خوێ. ڕۆژە بێ شێوە و ئۆقرەنەگرتووەکە لە تەمە سپییە تەڵخەکەدا شەپۆلی

ئەدا، لە ئاسۆ هەوراوییەکەشدا با هەورێکی پرتەقاڵیی مەیلەوسووری کۆ ئەکردەوە. بایەکی وشک تاو تاو هەڵیئەکرد، کەفی سپیی لالغاوە و لمۆزی ئەسپەکانی وشک ئەکردەوە و یاڵەکانیانی بەتوندی ئەشەکاندەوە و دوور ئەکەوتەوە و دڕکوداڵی سەر گردەکانی ڕائەماڵییە خوارەوە.

"لەوە ئەچێت بباریێت!" لە دڵی خۆما وتم.

هەستم بە تەنیایی و نیگەرانی کرد. سەرەواندمە ئەسپەکان، چونکە ئەیانویست خاو ببنەوە و نەرم بڕۆن. شەلاقەی[38] لاوازی قاچ درێژی ترساو بەرەو جێیەک لە کەناری چەمەکە ڕایانئەکرد، قنگڵاشکە[39] با ئەیهێنایە سەر ڕێگاکە. قنگر لە ولاتی ئێمە ناڕوێت، ڕەشەبا لە دیوی کازاخەوە هێناویەتی. ڕۆژ ئاوا بوو، هیچ ڕواڵەتێکی ژیان دیار نەما، ئیتر هیچ شتێک دەشتەکە ناپارێزێت کە گەرما شەکەتی کردووە.

تاریک بوو کە گەیشتمەوە سەر خەرمانەکە، باکە خستبووی، دنیا کپ بوو. بانگی دانیارم کرد.

"چووە بۆ سەر چەمەکە." پاسەوانەکە وەلامی دامەوە: "هەوا ئەوەندە کپ بوو، خەڵکەکە هەمووی ڕۆیشتۆتەوە، کزەی با نەبێت کەس لەسەر خەرمانەکە ئیشی بۆ ناکرێت!"

ئەسپەکانم برد بۆ ناو گیابەندەکە بلەوەڕێن و بڕیارم دا دابەزم بۆ سەرچەمەکە، شوێنەکەی دانیارم ئەزانی نزیک هەڵەتەکە.

دانیار لەوێ دانیشتبوو، چەمابووەوە سەری خستبووە سەر هەردوو ئەژنۆی و گوێی لە هاژەی ئاوەکە گرتبوو لە خوارەوە. ویستم بچم بۆ لای و دەست بکەمە ملی و شتێک بڵێم پێی خۆش بێت، بەڵام چی بڵێم؟ تۆزێک دوور وەستام و گەڕامەوە، دوای ئەوە ماوەیەکی زۆر لەسەر سەرووتەکە ڕاکشام و سەیری ئاسمانە تاڵە هەوراوییەکەم ئەکرد، ڕامابووم ژیان بۆچی ئەوەندە نالەبارە و بۆچی ئەوەندە قورسە بۆ تێگەیشتن!

جەمیلە هێشتا نەهاتبووەوە، ئەبێت چیی بەسەر هاتبێت؟ ئەوەندە ماندوو بووم خەوم لێنەئەکەوت. هەورەبرووسکەیەک لەناو هەورەکانەوە لەسەر چیاکان چەماخەی دا.

کە دانیار هاتەوە بۆ سەر خەرمانەکە، هێشتا نەنووستبووم.

بێ مەبەستانە بەسەر جێ خەرمانەکدا ئەخولایەوە و چاوێکی وردی لەسەر ڕێگاکە بوو، ئینجا لەپشت کۆمەڵێک سەرووتەوە خۆی شاردەوە، دڵنیا بووم ئەیەوێت بڕوات، ئیتر بۆ هەتاهەتایە لەو گوندە نامێنێت!

بەڵام بۆ کوێ ئەچێت؟ بەتەنیا و بێ ماڵ و حاڵ، کەسی نییە چاوەڕوانی بکات. کە تازە خەو ئەیبردمەوە، گوێم لە دەنگی پێچکەی عەرەبانەیەک بوو... لەوانەیە جەمیلە بێت!

نازانم چەندێک بوو خەوم لێکەوتبوو کاتێک خشەخش و قرچەی پووشەکە هاتە گوێم، یەکێک ڕێک بەلای گوێمدا بەسەر سرووتەکەدا ڕۆیی، هەستم کرد وەکوو پەڕێکی تەڕ بەر شانم کەوتبێ. چاوم هەڵبڕی، جەمیلە بوو، لە چەمەکەوە ئەهاتەوە، کراسەکەی گوشراو و تەڕ بوو، وەستا، بەترسەوە سەیری چواردەوری کرد، لەتەنیشت دانیارەوە دانیشت.

"دانیار، هاتووم بۆ لای تۆ، بە پێی خۆم هاتووم." بەبێدەنگ وتی.

هەموو شوێنێک خامۆش بوو، هەورەبرووسکەیەک بێدەنگ لە ئاسمانەوە دابەزییە سەر زەوی.

"تۆ عاجزیت لێم؟ زۆر عاجزیت؟" دیسانەوە خامۆشی، تەنیا دەنگی دارمانی تۆپەڵێک قوڕ بۆ ناو چەمەکە.

"خەتای من بوو؟ ئەی خەتای تۆیشی تیا نییە؟"

هەورەبرووسکەیەکی تر لەسەر چیاکان داگیرسا، دەموچاوی جەمیلە لە ڕووناکییەکەدا بەتەواوی دەرکەوت، خۆی دا بەسەر دانیاردا، شانەکانی لە

باوەشی دانیاردا گرژ ئەبوون و ئەهاتنەوە یەک، دوایی لا چوو و لە پاڵیا ڕاکشا.

گڕەیەکــی گەرم لە دەشــتەکەوە هــات، کــردی بە گێژەڵــووکە و پووشــەکەی بــرد بە ئاســمانا و دای لە چادرە شڕەکەی قەراغی جێ خەرمانەکە، لوولی کرد و فڕێـــی دایە گوێڕێگـــاکە. دیســـانەوە شـــکاندنەوەی چەخماخەیەکی شینی هەورەبرووسکەیەک، هەورەکەیان بڕی. هەم ترسناک و هەم جێی سەرسوڕمانە! زریانێک بەڕێوەیە، دوایین زریانی هاوین.

"تۆ وا ئەزانیت ئەوم لە تۆ خۆشتر ئەوێت؟" جەمیلە بەسۆزەوە چپاندی: "هەرگیز! هەرگیز! هەرگیز! هەرگیز خۆشــی نەویســتووم. هەتــا لە پەراوێــزی نامەکانیشــدا سڵاوم لێ ئەکات. من نە پێویستم پێیەتی و نە خۆشم ئەوێت، چونکە تازە درەنگە، من گوێ نادەمە ئەوەی خەڵـک چـی ئەڵـێن! تەنیـا خۆشەویسـتەکەم، هەرگیـز دەستبەردارت نابم! زۆر دەمێکە خۆشم ئەوێیت، خۆشم ئەویستی و چاوەڕوانم ئەکردیت هەتا پێش ئەوەی بتناسم، پێش ئەوەی بێیت بۆ ئێرە، وەکوو ئەوەی بزانیت من لێرە چاوەڕێتم!"

بریســـکەی شــینی خــواروخێچی هەورەبرووســـکە ئەکەوتــنە نــاو چەمەکە نزیـک هەڵەتەکە، نـمەی بــاران بەخواری لەسەر پووشەکە خرمەی ئەهات.

"جەمیلە، خۆشەویستەکەم جەمیلە!" دانیار چپاندی، بە خۆشترین نازناوی کازاخی و کەرگیزی بانگی ئەکرد: "منیش هەروەها دەمێکە تۆم خۆش ئەوێت. من لە سەنگەرەکاندا خەونم بە تۆوە ئەبینی، ئەمزانی خۆشەویستەکەم خەڵکی گوندەکەی خۆمانە، ئەوە تۆ بوویت جەمیلەکەم! ڕووم تێ کە با تێر سەیری چاوەکانت بکەم!"

زریانەکە گەیشتە سەرمان.

لبادەکەی لە کەپرەکەی کردبووەوە، وەکوو باڵی چۆلەکەیەکی باڵشکاو تەپەتەپی بوو.

بارانەکە کە با کە لە ژێرەوە ئەیهێنا، تاو تاو ئەهاتە خوارەوە وەکوو زەوییەکە ماچ بکات. پەڵەی ڕووناکیی هەورەبرووسکە بە ئاسماندا ئەهاتە خوارەوە وەکوو هەرەسی بەفر. چەماخەی هەورەبرووسکە شاخەکانی ڕووناک ئەکردەوە و ڕەشەباش ئەیلووراند و خۆی ئەکرد بە دۆڵەکانا.

باران دایکرد، خۆم کرد بەناو سرووتەکەدا هەستم بە لێدانی دڵم ئەکرد لە سنگما. دڵم خۆش بوو، وەکوو یەکێک دوای نەخۆشییەکی قورس چاوی بە هەتاو کەوتبێتەوە. باران و ڕووناکیی هەورەبرووسکەکان لەژێر سرووتەکەشەوە ئەمگەیشتن. شاد بووم، بەدەم زەردەخەنەوە خەوم لێکەوت. دڵنیا نەبووم ئەوەی گوێم

لێیە، دەنگی خرمەی بارانەکەیە لەسەر پووشەکە یان چپەی دانیار و جەمیلەیە.

وەرزی بارانبارین نزیک بۆتەوە، بەم زووانە پاییز دەست پێ ئەکات.

هەوا پڕ بووبوو لە بۆنی سنەوبەر و قەسەڵی[٤٠] تەڕ، بەڵام لەم پاییزەدا چی چاوەڕوانمان ئەکات؟ لەبەر هەر هۆیەک بێت، لێرە و لەوێ، من جارێ بیرم لەوە نەکردبووەوە.

ئەو پاییزە دوای ئەوەی دوو ساڵ بوو لە قوتابخانە دابڕابووم، چوومەوە. کە دەوام تەواو ئەبوو، عادەتەن ئەچووم لەسەر کەنارە لێژەکەی چەمەکە دائەنیشتم لەتەنیشت جێ خەرمانە تازە چۆڵکراو و وێرانبووەکە. لەوێ یەکەم هێڵکارییەکانم کێشا، ئەوەم لەبیرە کە دواتر بۆم دەرکەوت کارەکانم هیچ باش نەبوون.

"ئەم بۆیانە باش نین، خۆزگە بۆیە چاکە چاکەکان ئەبوو!" لەگەڵ ئەوەشدا ڕاست بڵێم، هەر نەشمئەزانی بۆیەی چاک چۆنە.

زۆر درەنگ بۆم دەرکەوت کە بۆیەی چاکی زەیتی هەیە لە لوولەی بچووکدا، لەگەڵ ئەوەشدا وا دەرئەکەوت مامۆستاکانم ڕاستیان ئەکرد: من پێویستە بخوێنم، هەر چەند ئەوە تەنیا خەون بوو، چونکە هێشتا براکانم هەواڵێکیان نەبوو، دایکیشم هیچ کات ڕێگای

نەئەدام -چونکە لە ماڵەوە تەنیا منی هەبوو، کوڕی گەورەی ماڵ و نانپەیداکەری دوو خێزان- بچم بخوێنم. من هەرگیز نەمئەوێرا باسی ئەو بابەتە بکەم، ئەوەشی زیاتر دڵتەنگی کردبووم؛ پاییزی ئەو ساڵە زۆر جوان بوو، ئەگریا بۆ ئەوەی وێنەی بکێشیت.

چەمی کورکۆریوی سارد؛ لێڵ بوو، لووتی تاشەکان بە قەوزەی سەوزی تاریک و نارنجی داپۆشران، قەدی ڕووتی پونگە گوڵ پەمەییەکان لەگەڵ یەکەم زوقما سوور بوون، بەڵام خەڵفە چنارەکان هێشتا گەڵا تەنکە زەردەکانیان پێوە مابوو.

دەوارە دووکەڵاوییە باران کوتاوەکەی کۆچەرییەکان ئەتوت پەڵەی ڕەشن لەسەر گیا سوورەکەی دەشتەکەی لافاو دابووی بە سەریا، لە دووکەڵکێشەکانەوە هێڵی دووکەڵی شین ئەچوو بەئاسمانا. جوانوو و نۆما لاوازەکان بە دەنگی بەرز ئەیانحیلاند، مایینەکانیش دوور ئەکەوتنەوە بڵاوەیان ئەکرد، چونکە ئیتر نەتئەتوانی بیانکەیت بە ڕەوگ تا بەهار ئەهات. ڕانەمەڕەکان کە لە شاخەکانەوە هاتبوونە خوارەوە، بە دەشتەکەدا بڵاو بووبوونەوە.

دەشتە وشکە تاریکەکە بووبوو بە گلۆڵەیەکی ئاڵۆسکاو لە تووڵەڕێ.

لەپڕ بای دەشتەکە هەڵیکرد، ڕەنگی ئاسمان قوڕاوی بوو، باران و کزەی سارد، ئاماژەی بەفر دایکرد. ڕۆژێکی تۆزێک خۆش چوومە خوارەوە بۆ چەمەکە، چلێک بەلەکی ئاگرین، لە ڕووەکەکانی چیاکان کە لەسەر کەنارە لمەکە ڕوابوو، سەرنجی ڕاکێشام. لەناو پونگەکانا دانیشتم لە جێیەک لە بوارەکەوە دوور نەبوو، خۆر ئاوا بووبوو، لەپڕ دوو کەسم بینی، دیار بوو لە بوارەکە پەڕیبوونەوە، دانیار و جەمیلە بوون. نەمئەتوانی چاو لەسەر دەموچاوە پڕ دڵەڕاوکێکەیان بەڵام پێداگرەکەیان بتروکێنم. دانیار تورەکە عەسکەرییەکەی دابوو بە شانیا و خێرا ئەڕۆیشت، دامێنی پاڵتۆ کراوەکەی ئەیدا لە ملی جزمە مشەما دڕاوەکەی. جەمیلەش دەسرێکی سپیی بەستبوو بە سەریەوە و لە پشتەوە بەری دابووەوە.

جوانترین کراسی گوڵداری لەبەردا بوو کە لە بۆنە و شاییەکاندا خۆی پێوە ئەنواند، چاکەتێکی ناوداری نەخشێنراوی بە سەردا لەبەر کردبوو، بە دەستێکیان بوخچەیەکی نابووە بندەستی و دەستەکەی تری گرتبوو بە قایشی جانتاکەی دانیارەوە و قسەیان ئەکرد.

ئەو ڕێگایان گرتبوو کە بە دۆڵەکەدا بەناو گژوگیا زەبەندەکەدا سەر ئەکەوت. بە چاو دوایان کەوتم، نەمئەزانی چی بکەم، ئەبێت بانگیان بکەم؟ بەڵام دەنگم دەرنەئەهات.

دوایـــین تیشـــکی ئەرخەوانـــی ئەیـــدا بەســـەر پەڵە هەورەکانـــا کە بەخێرایـــی بەســـەر زنجیرەشـــاخەکاندا ئەڕۆیشـتن، شـەو خێرا تاریک ئەبوو. دانیـار و جەمیلە جارێـک ئاوڕیـان نەدایەوە بـۆ دواوە، کاتێـک بەرەو یەکتربڕی سکەی شەمەندەفەرەکە ئەڕۆیشتن. یەک دوو جار سەریان لەناو زەبەند و گیا بەرزەکانەوە دەرکەوت و ئیتر بەیەکجاری دیار نەمان.

"جەمیل... ـە... ـە ... ـە!" بە هەموو دەنگم هاوارم کرد.

"ل... ـە... ـە... ـە!" شـاخەکە بێ هیچ ئومێدێک دەنگی دایەوە.

"جەمیل... ـە... ـە... ـە!" جـارێکی تـر هـاوارم کـرد و شێتانە بەڕاکردن بەناو چەمەکەدا دوایان کەوتم.

پریشـــکی ســـاردی ئـــاوەکە ئەیـــدا لە دەموچـــاوم و جلەکـانی تەڕ ئەکـردم، بەڵام مـن هەر ڕامئەکـرد، چـاوم خـاکەکەی بەر پێمـی نەئەدی، قـاچم لە شـتێک گیـرا و کەوتـم، لە جێـی خۆمـا پـاڵ کەوتـم، بـێ ئەوەی سـەر هەڵبڕم؛ فرمێسکی گەرم بە دەموچاوما ئەهاتە خوارەوە. تاریکییەکە ئەتوت چۆکی داداوەتە سەر سنگم. گوێم لە دەنگی گیا دەرزیلەییەکان بوو بەدڵتەنگییەوە ئەگریان.

"جەمیلە! جەمیلە!" دامە پرمەی گریان.

ئەبووایە ماڵئاوایی لە دوو کەس بکەم، کە نزیکترین و خۆشەویســتترین کەســی مـن بـوون. ئێسـتا کە لەســەر

زەوییەکە ڕاکشاوم، لەپڕ تێگەیشتم کە جەمیلەم خۆش ئەوێت. بەڵێ، یەکەم خۆشەویستیم بوو، خۆشەویستیی منالی.

زۆر لەوێ بەڕاکشاوی مامەوە، سەرم کردبووە سەر قۆڵە تەڕەکەم.

مـن تەنیـا ماڵئـاواییم لە جەمـیلە و دانیـار نەئەکـرد، بەڵکوو ماڵئاواییم لە منالیی خۆم ئەکرد.

کە ســەرەنجام بەتـاریکی خـۆم کـێش کـردەوە بـۆ ماڵەوە، جەنجاڵییەکی گەورە لەبەر ئاواییدا بوو، سیرەی ئـاوزەنگی ئەهـات، خەڵـک ئەسـپەکانیان زیـن ئەکـرد، ئوسمانی مەست بەسـەر ئەسپەکەیەوە هەڵئەبەزییەوە، بە هەموو دەنگی ئەیبۆلاند: "ئەبووایە زۆر لەمەوبەر ئەم سـەگبابی زۆڵەمـان لە ئـاوایی دەرکـردایە! شــەرەفی هەمـوو عەشـرەتی شـکاند! لە هەر شـوێنێک چـاوم پـێی بکەوێت، یەکسـەر ئەیکوژم! گرنـگ نییە چەنـد لەسـەری بەنــد ئەکــرێم. قبــوڵ نــاکەم ڕێبــوارێکی دەربەدەر ژنەکانمـان هەڵبگرێـت! وەرن کـوڕانی ئـازا، لەدەسـتمان دەرناچێت، لە وێستگەکە ئەیانگرین!"

ئەژنۆم شکا: ئەبێ لە چی ڕێگایەکەوە دوایان کەون؟ بەلام کاتێک دڵنیا بووم جادە سەرەکییەکە ئەگرن بەرەو وێستگەکە نەک ئەو ڕێگایەی ئەچێتەوە سەر یەکتربڕی سـکەکە، خـۆم کـرد بە مـالا و خـۆم کـرد بەژێـر پـالتۆ

کەوڵە مەڕەکەی باوکما، سەری خۆم داپۆشی بۆ ئەوەی کەس فرمێسکەکانم نەبینێ.

دوای ئەوە لە ئاوایی چەند قسەوباس کرا لە بارەی ئەو بەزمەوە. ژنـــان کێبڕکێیـــان بـــوو لە بەدنـــاوکردنی جەمیلە.

"بێعەقڵە! لەقەی لە بەختی خـۆی دا، خێزانێکی ئاوای بەجێ هێشت!"

"نـــازانم دڵـــی چووبـــوو بە کـــوێی ئەم لە برســـا مردووەیا؟"

"گـــوێی مەدەرێ، کچـــۆڵەی جـــوان زۆری پێناچێـــت پەشـــیمان ئەبێـــتەوە، بەڵام دوای ئەوەی کـــار لە کـــار ترازاوە."

"من ئەڵێم سادق چییەتی! مێردێکی باش و پیاوێکی ئیشکەر! باشترین خانەدانی ئاوایی بوو!"

"ئەی خەسـووی؟ کـێ خەسـووی وای هەیە! بـا بچـێ بـزانم ئـامۆژنێکی وای تـر ئەدۆزێـتەوە! بـێعەقڵە، منـاڵە سـەری لە خـۆی شـێواند، لە پێنـاوی چـی؟ لە پێنـاوی هیچا!"

لەوانەیە مـــن تـــاکە کەس بـــووم لـــۆمەی جەمـــیلەم نەئەکرد، براژنە کۆنەکەم. من بەتەنیا ئەمزانی دانیار لە

ناخی خۆیدا لە هەمووومان دەوڵەمەندترە. نا، بڕوام بەوە نییە جەمیلە لەگەڵیدا کامەران نەبێت!

بەڵام بەزەییم بە دایکما ئەهاتەوە، بەداخەوە بووم کە گوڕوتینەکەی جارانی لەگەڵ جەمیلەدا ڕۆیشت، دڵتەنگی و بێئومێدی لەسەر ڕووخساری نیشت، وەکوو تازە تێگەیشتووم، نەیئەتوانی ئەو ڕاستییە قبوڵ بکات چارەنووس ئەوەندە دڵڕەقانە هەموو ئەو کولتووورە کۆنە جوانە تێک بشکێنێت. ئەگەر دارێکی گەورە زریان لەبن هەڵیکێشێت، جارێکی تر هەڵناسێتەوە. نەفسبەرزیی دایکم هەرگیز قبوڵی نەکردووە بە یەکێک بڵێ دەرزییەکی بۆ پێوە بکات، ڕۆژێک لە قوتابخانە هاتمەوە بینیم دایکم دەستی ئەلەرزێ، کونی دەرزییەکەی نەئەبینی و بۆی پێوە نەئەکرا و ئەگریا.

"ئا بۆم پێوە کە!" داوای لێ کردم و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا: "سەرئەنجامی جەمیلە باش نابێت. ئای چەند کەیبانوویەکی چاک بوو! بەڵام تازە ڕۆیی، وازی لە ئێمە هێنا. بۆچی ڕۆیشت؟ ئەوەندە لای ئێمەی پێ خراپ بوو؟"

ویستم دەست بکەمە ملی دایکم و دڵخۆشیی بدەمەوە و پێی بڵێم دانیار چی جۆرە پیاوێک بوو، بەڵام نەموێرا، چونکە بە شێوەیەکی ترسناک سووکایەتیم پێ ئەکرد.

بەڵام ڕۆژێــک ئەو ڕۆڵە بێــوەیەی مــن لە هەمــوو مەسەلەکەدا گێڕام، ئیتر بەنهێنی نەمایەوە.

زۆری نەبــرد ســادق هــاتەوە، بێگومــان زۆری پــێ دڵتەنگ بـوو. کاتێک کە سـەرخۆش بـوو، بە ئوسـمانی وت: "بــا هەڵگیرێــت، شــایانی ئەوەیە! بــڕوات لە سەرەنوێلکێک بتۆپێ. بگەڕێی هەر ژن زۆرە، جوانترین ئافرەتی قژ کاڵ مەمنوونی خوێڕیترین پیاوە."

"زۆر ڕاسـتە!" عوسـمان وەڵامــی دایەوە: "مـن داخــی ئەوەم لە دڵایە نەمگرت، دەستبەجێ ئەمکوشت! ئەویش قژەکەیم ئەبەست بە کلکی ئەسپەکەمەوە و ڕامئەکێشا. لەوە ئەچێت بەرەو باشـوور ڕۆیشـتبن بـۆ پەمـووچنین یان چوون بۆ نـاو کازاخەکان. ئەمە یەکەم جاری نییە سەرگەردان ئەبێت! بەڵام ئەوەی ناچێت بە عەقڵما، چۆن ئەمە لەم شــوێنەدا ڕووی دا و کەس ئاگــای لە هــیچ نەبـوو؟ بـۆ کەس پێشــبینیی شـتێکی وای نەکـرد؟ ئەو قەحپەیە خـۆی هەمـوو شـتێکی تەرتیـب کردبـوو. ئـای خۆزگە دەستم لێی گیر ئەبوو!"

کە گـوێم لەم قسـانە بـوو، حەزم ئەکـرد بڵـێم: "ئەی لەبیـرت چـوو چۆن لەسـەر خەرمـانەکە پەلامـارت دا و دەســتت بــۆ بــرد و سووکوســەلیمی کردیــت! ئێســتا ئەوەندە پیاوی باشیت!"

ڕۆژێک لەماڵەوە دانیشتبووم، ڕەسمێکم بۆ نەشرەی قوتابخانەکەمـان ئەکـرد، دایکـم لەدەوری ئـاگردانەکە هەڵئەسووڕا، لەپڕ سادق خۆی کرد بە ژوورا، ڕەنگی هەڵبزڕکـابوو، چاوەکـانی ئاگریـان لـێ ئەبـاری، بەرەو ڕووی من هات و پارچەیەک کاغەزی دا بە دەموچاوما.

"ئەمە تۆ کردووتە؟"

شڵەژام، یەکەم وێنەکەم بوو، دانیار و جەمیلە زیندوو ئەهاتنە بەر چاوم کە لە وێنەکەوە سەیریان ئەکردم.

"بەڵێ، من کردوومە."

"ئەمە کێیە؟" توند پەنجەی خستە سەر کاغەزەکە.

"دانیارە."

"ناپاک!" سادق هاواری کرد.

وێنەکەی پارچە پارچە کرد، دەرپەڕییە دەرەوەوە و دەرگاکەی بەدوای خۆیدا داخست.

دوای بێـدەنگییەکی زۆر و بێئومێـدانە، دایکـم لێـی پرسیم: "تۆ ئاگاداری ئەو بەزمە بوویت؟"

"بەڵێ."

لەپاڵ سۆپاکەدا وەستابوو، شانی دابووە سەری، بە تێڕامـان و سەرزەنشتەوە سەیری کردم. کاتێک منیش

وتـــم: "جـــارێکی تـــریش ڕەســـمیان ئەکەمەوە." بەکەساسییەوە سەرێکی با دا.

سـەیری پـارچە کاغەزەکـانم کـرد لەسـەر زەویـیەکە، ئازارێک کە بەرگەی نەئەگیرا؛ تاساندمی. با وا بزانن من ناپاکم، ناپاکیم لە کێ کردووە؟ خێزانەکەم؟ خزمەکانم؟ بەڵام مـن ناپـاکیم لە حەقیقەتـی ژیـان نەکـردووە، لە حەقیقەتـی ئەم دوو مـرۆڤە! نەمئەتـوانی ئەمە بـۆ کەس ڕوون بکەمەوە، هەتا دایکیشم تێنەئەگەیشت.

هەمـوو شـتێک لەبەر چـاوم کەوتە مەلە، لەبەر چـاوم پـارچە کاغەزەکـان زینـدوو بـوون و لەسـەر زەویـیەکە ئەجـووڵان. بیـرکەوتنەوەی ئەوەی دانیـار و جەمـیلە لە پەڕە کـاغەزەکەوە سـەیریان ئەکـردم؛ ئەوەنـدە زینـدوو بوو لەپڕ وام هەست کرد گوێم لە دەنگی گۆرانییەکەی دانیــارە، ئەوەی شـــەوەکەی ئـــاب کە هەرگیـــز لەبیـــر ناچێتەوە. کە ئەمهێنایە بەر چاوم چۆن ئاواییان بەجێ هێشـت؛ هەسـتم بە ئـارەزوویەکی پێداگر ئەکـرد بچـمە ســـەر جـــادەکە و وەکـــوو ئەوان بـــڕۆم، بە بڕیـــار و جورئەتەوە ملی ڕێگای سەختی کامەرانی بگرم.

"ئەمەوێت بڕۆم بخوێنم، بە باوکم بڵێ. ئەمەوێت ببم بە شێوەکار!" بە دایکم وت.

دڵنیا بووم ئەچێ بەگژما و دەست ئەکات بە گریان، براکانمی بیر ئەکەوێتەوە کە لە جەنگدا کوژران، بەڵام

جێـی سەرسـوڕمان بـوو بـۆم نەگریـا، بەدڵتەنگـی و بەنەرمی وتـی: "ئەگەر ئەتەوێ دوای ئەمە بکەویت، واتە بەچکەکـانم پەڕوباڵیـان دەرکـردووە و ئەیانەوێـت هەریەکەی بە لایەکدا بفـڕن. ئێمە چـووزانین تـۆ چەنـد بەرز ئەبیتەوە؟ لەوانەیە تـۆ ڕاست بیت. بـڕۆ، لەوانەیە گەیشـتیتە ئەوێ پەشـیمان بیـتەوە. ڕەسـمکردن و فڵچەوەشـاندن کاسـبی نیـیە، بـڕۆ بخـوێنە و بـۆت دەرئەکەوێ من ڕاستم. ئێمەت لەبیر نەچێت."

لەو ڕۆژەوە، یەکسـەر دوای ئەوەی مـن چـووم بـۆ خوێندن؛ ماڵە بچکۆلەکە لە ئێمە جیا بووەوە...

ئەوە هەموو چیرۆکەکەیە.

دوای ئەوەی لە قوتابخـانەی هـونەر دەرچـووم، پشـتگیرییان کـردم بـۆ ئەکادیمیـا، تێزی عەمەلییەکەشـم ئەو تـابلۆیە بـوو کە دەمێـک سـاڵ بـوو خەونـم پێـوە ئەبینی، قـورس نییە بۆی بچیت کە تـابلۆکەی دانیـار و جەمیلەیە. ئەبینرێن بە ڕێگایەکی پاییزی بە دەشتەکەدا ئەڕۆن، لە پێشیانەوە ئاسۆیەکی فراوانی فرەڕەنگە.

هەر چەند تابلۆکەم ناتەواوە، بەڵام کەس لەپرێ نابێت بە کـوڕێ... ئەوە سـامانی مـنە، چـونکە یەکەم کـاری ئەفراندنی منە.

زۆر جـار هەیە لە کارەکـانی خـۆم ڕازی نـیم، زۆر ئەکەومە چرکەسـاتی نـاڕەحەت کاتێـک بـڕوام بە خـۆم

نامێنێت، لەو کاتانەدا سەرنجم ئەچێتەوە سەر تابلۆکەی کە زۆرم خۆش ئەوێت، دانیار و جەمیلە، تێیان ئەڕوانم هەموو جارێک قسەیان لەگەڵ ئەکەم: "ئێستا ئێوە لە کوێن؟ چی ڕێگایەک ئەکوتن؟ ئێستا دەشتەکە پڕە لە جادەی تازە بەناو کازاخستاندا، بەرەو ژوور تا ئەگاتە ئالتای و بەناو سیبیریادا. زۆر پیاوی ئازا لەوێ ئیش ئەکەن، لەوانەیە ئێوەش لەوێ بن. جەمیلەکەم، ڕۆیشتیت بێ ئەوەی ئاوڕێک بۆ دواوە بدەیتەوە.

لەوانەیە ماندوو بیت، لەوانەیە بڕوات بەخۆت نەمابێت، خۆت بدە بەسەر شانی دانیاردا، لێی گەڕێ با گۆرانییەکەی خۆیت بۆ بڵێ، بۆ خۆشەویستی، بۆ خاک، بۆ ژیان.

لەوانەیە دەشتەکە دەنگ بداتەوە، بە پشکوتنی هەموو شێوە و ڕەنگەکان خۆی برازێنێتەوە. شەوەکەی 'ئاب'ت لەیاد نەچێت! بەردەوام بە جەمیلە، هەرگیز پەشیمان مەبە لەوەی کردت، چونکە کامەرانیی نارەحەتی خۆت دۆزییەوە!"

کە سەیرم ئەکردن، گوێم لە دەنگی دانیار ئەبوو بانگی ئەکردم: "مەوەستە!" واتە کاتی ئەوە هاتووە خۆم ئامادە بکەم بۆ سەفەر... بە دەشتەکەدا ئەگەڕێمەوە بۆ ئاوایی، لەوێ ڕەنگی تازە ئەبینم.

لەوانەیە هەمــوو فڵــچە وەشــاندنێکم دەنگــدانەوەی گــۆرانییەکی دانیــار بێــت! لەوانەیە هەمــوو فڵــچە وەشاندنێکم دەنگدانەوەی ترپەی دڵی جەمیلە بێت!

هەینی ٢٠١٩/٣/١٥
کات ٦ و ٤٢ دەقیقەی ئێوارە
سلێمانی
ئەگەر ئەتەوێت پەیامێك بۆ وەرگێڕ بنێریت، فەرموو:
tofiqabdol@gmail.com

**با تۆش بیزانیت:**

١. خشتی قوڕ کە لە کوورەدا سوور نەکراوەتەوە.

٢. Sadyk: ئینگلیزییەکەی لە "سەدیق" ئەچێت، بەڵام کە گوێم لە فیلمە ڕووسییەکە گرت؛ ئەڵێ "سادیق"، بۆیە منیش کردم بە "سادق". گەلی کەرگیزیا موسڵمانن، بۆیە ناوەکانیان و هەندێ دابونەریتیان ئیسلامییانەیە.

٣. کیچـنە: دیـارە بە زمـانی خۆیـان ئاوەڵنـاوێکی ڕێزگرتنە لە ئافرەتێکی بەتەمەن لە ئاستی دایکدا.

٤. جەمیلە: لای ئەیتماتۆڤ "جەمیلیا"یە، لە زۆر زمانی تریشـدا ناونیشـانی چیـرۆکەکە و نـاوەوەش هەر وا دانراوە، لە فیلمەکەشدا ئەڵێن "ژەمیلیا".

٥. لە تێکسـتەکەدا تـا کۆتـایی هەر ئەو دوو وشـەیە بەکار ئەهێنێت، بەڵام من دوای ئەم جارە کوردیم بەکار هێناوە.

٦. ئـافرەت کە قـاڵی ئەچنێت یـان ئەبڕێت، چەنـد کـار بکات؛ ئەبێت بە چیچکانەوە بێت، بۆیە وەکوو نموونەی پشتیەشە ئەهێنرێتەوە.

٧. برای مێرد: بە کوردی "هێوەر" یان "شـووبرا"ی پێ ئەڵێن.

٨. ئەم ناوەش "سەید"ە، بەڵام لە ئینگلیزییەکەدا بە "ت" نووسراوە و لە فیلمەکەشدا هەر بە "سەییت" ناو ئەبرێت.

٩. لە ڕۆمانەکانی تری ئەیتماتۆڤیشدا ئەم وشەیە بۆ ڕێزگرتن لە ئافرەتی بەتەمەن بەکار هاتووە.

١٠. وەکوو لە ئینگلیزییەکەدا دیارە "دانیار" نییە، بەڵکوو "دانییار"ە و لە فیلمەکەشدا "دانی یار"ی پێ ئەڵێن، لەوانەیە ئەم ناوە لە زمانی کەرگیزیدا مانایەکی هەبێت، بەڵام من بۆ ئاسان گۆکردن تا کۆتایی "دانیار"م داناوە.

١١. لەو لادێیانەی داری سووتاندنیان نییە و ئاژەڵدارن، پاشەڕۆی وڵاخەکانیان: (شیاکە و پشقل، قشپل)ی مەڕوماڵاتەکانیان لە گەوڕەکان ئەهێننە دەرەوە و بە قاچ و خاکەناز هەڵیئەشێلن بەیەکدا و دواتر یەکە یەکە ئەیکەن بە تەنێکی درێژکۆلە پێی ئەڵێن (تەپکە - تەپاڵە) و لەبەر هەتاو ئەمدیودیوی ئەکەن و وشکی ئەکەنەوە بۆ سووتاندن، ئەو کارە پێی ئەڵێن "شیاکەپێژان". لە گۆرانیی فولکلۆری کوردیدا ئەڵێت:

**هاتە خوارێ لە لێژی**

**ئەڵێی برنەوی درێژی**

**دایکی بەقوربانی بێت**

١٢. وڵاخــی بەرزە ڕۆیشــتنی ئاســایی و غــارکردنی هەیە، ڕەوتێکــی تــر لەنێــوان ئەو دووانەدا پێــی ئەڵــێن "لۆقە" یان "یەرغە".

١٣. کۆمەڵێک وڵاخی بەرزە، بەیەکەوە پێیان ئەوتری "ڕەوگ".

١٤. نووســەر تـا کۆتـایی بە نـاوی ئەوانەوە هەر "اللـه" بەکار دێنێت، بڵام من کردوومەتەوە بە خوا".

١٥. ســــەروو: ئەو درەخــــتە قــــوچەکییە بەرزەیە لە خێزانی سنەوبەر کە لە ئەدەبی کلاسیکی کوردیدا باڵای بەرزی پێ چووێنراوە. سنەوبەر، جۆرەکانی ترە.

١٦. دەسرپودەسرۆکە، دارشتنەوەی "دەستەسڕ"ە.

١٧. ئەو دەغڵودانەی ئەدورێتەوە و ئەکرێت بە "مەڵۆ" و "شـارا" لە کـاتی گواستنەوەدا بۆ سـەر خەرمـان، پێی ئەڵێن "کڵۆش".

١٨. ئەمـیش هەر "عوسـمان"ە، دیـارە ئەمـانیش دەنگی "ع" یان نییە، بۆیە ئەڵێن "ئوسمان"، وەک چۆن خۆمـان ئەڵێــین (وەســمان، ئەولکەریـم، ئەول)، خزمــانم بە مــن ئەڵێن "تۆفیقی ئەحەی مام ئەول".

١٩. ئەم پەنــدە لای خۆمــان و گەلانــی تــریش هەیە، هەریەکەی بە جۆرێک، بەڵام بە هەمان مەبەست.

٢٠. (زامــار – زامــدار، برینــدار): هەردووکیــان لە کوردیدا بۆ یەک مەبەست بەکار دێن، بەڵام بە ڕای من "برین" ئەوەیە کە بەسروشتی لە ئەنجامی نەخۆشییەک، هەوکردنێک یان ڤایرۆسێک تووشی جەستە ئەبێت، بۆیە ئەو کەســە "بریندار"ە، بەڵام جێگای کەرەستە تیژەکان وەکوو چەقۆ و خەنجەر و... تاد، لەگەڵ تەقەمەنییەکان وەکــوو فیشــەک و... تــاد؛ "زام"ە نەک "بــرین"، بــۆیە کەسەکە (زامار - زامدار)ە نەک "بریندار".

لە فولکلۆری کوردیدا ئەڵێت:

**دەستم لێ مەدە گشت گیانم زامە**

**دیسان زامێ تر هاتووە لەم لامە.**

٢١. توڵپار: ئەسپێکی باڵداری ئەفسانەییە.

٢٢. لە پەرێــزدا، ئەو بەشــەی لاســکی گەنــمەکە بە زەویــیەکەوە ئەمێنێــتەوە یــان ئەوەی کۆمبــاین لەدوای خۆیەوە فڕێی ئەدات؛ پێی ئەڵێن "سرووت".

٢٣. کاتێــک دوو کەس بە هاوکــاریی یەک؛ فەردەیەک یــان بــارێکی قــورس بــار دەکەن، وەکــوو تەوقە بــکەن؛ دەســت ئەخەنە نــاو دەســتی یەک و فەردەکە ئەتلێنــنەوە

به سەریدا و بە دوو دەستەکەی تریان لە بنەوە بەرزی ئەکەنەوە، بەمە ئەڵێن "دەستبار". لەبەر قورسیی بارەکە و نــارەحەتیی بەرزکــردنەوەی، ناچــارن دەســتی یەک بگوشن و سەر بنێن بە سەری یەکەوە.

٢٤. ئەو تەنە بچکــۆلە درێژکــۆلە قــوچەکییەی پــێش هەڵوەراندن، دەنکە گەنمەشامییەکەی پێوەیە (هەر چەند چیرۆکەکە هەمووی لەسەر بەرهەمی گەنم بینا کراوە، بەڵام بەپێی درووشمەکە؛ پێدەچێت زۆرینەی ناوچەکانی تر گەنمەشامی ببەن بۆ وێستگەکە).

٢٥. ئەگەر ســـەیری کـــارگە (غەســـاله)ی چەو و لمەکان بکەیت؛ ڕێگایەکی تایبەتی کووڕ دروست کراوە گەلابەکانی پیا سەر ئەکەوێت بۆ سـەر بێژنگەکە، یان بناغەیەکی خانوو کە لە زەوی بەرزترە بە خۆڵ هەمان ڕێگـای بـۆ دروسـت ئەکرێـت، گەلابە سـەر بکەوێـت و خۆڵی تێ بکات، یان ئەوانەی لە نەخۆشـخانە و ئۆتێل و شـوێنە گشـتییەکاندا هەیە عەرەبـانەی منـاڵ و نەخۆشـی پیا سەر کەوێت، پێی ئەڵێن "تاکۆس" یان "ڕەمپە".

ئەمەی چیرۆکەکەش لەبەر ئەوەی گەنمێکی زۆر دێت ئەگەر لە زەویدا ڕۆبکرێت؛ ڕووبەرێکی زۆری ئەوێت و بەرز نـاکرێتەوە، بۆیە ئەم تاکۆسـەیان بە داربەسـت بـۆ دروسـت کـردووە، سـەرەوژوور هەڵئەکشـێت تـا نزیـک ژێـر جەمەلـۆنەکە و ئیتـر ڕاسـت ئەبێـتەوە، لەوێـوە بە هەردوو دیودا گەنمە هەڵئەڕێژن بۆ ئەوەی قوت بێت و

جێگـا کەم بگرێـت. ئەگەر سـەیری فـیلمەکە بکەیـت، باشترە.

٢٦. ئەو بەشـەی گەردن، پشـت گـرێکەوە، حەسـەن زیرەکـی مەزن ئەڵێـت: "کەژاڵ چـاوجوان... بمبـوورە... نەمزانی ئەوکم گەستی."

٢٧. جەواڵ: کەرەستەیەکی دەستکردە وەکوو گوێنی، لە بەنی ڕەش و سپیی خوری و موو دروست ئەکرێت، بەڵام قەوارەی گەورەیە، بۆ هەڵگرتنی تۆو و دانەوێڵە و ساوەر بەکار دێت. کورد ئەڵێت: "ئەوەی لە مشک بێت، جەواڵ ئەدڕێت."

٢٨. تەنەکە: لە بنچیـنەدا تەنەکەی ڕۆنە، لە لادێکانـدا وەکـوو پێـوەر بەکـار ئەهێنرێـت، کە ١٧ کیلـۆ گەنـم ئەگرێـت. بە دوو تەنەکە ئەوترێـت "ڕبە". لای خۆمـان عادەتەن تەنەکەکان هیی ڕۆنی "ڕاعی" و "نێرگز" بوون.

٢٩. کەسێک هاوسەنگیی خۆی بۆ ڕانەگیریت.

٣٠. حاڵەتێـک کە خەریـک ئەبیـت بکەویـت و خـۆت ئەگریتەوە.

٣١. جـاو: واتە قوماشـی خـامی سـپی. کـورد ئەڵـێ: "گەزی چی و جاوی چی!"

٣٢. کۆرپەی ئەسپ و مایین، نێرەکەیان کە ئەبێتەوە بە ئەسپ؛ "جوانوو"ە، مێیەکەش کە ئەبێتەوە بە مایین؛ "نۆما"یە.

٣٣. ماناس: قارەمانێکی ئەفسانەیی کەرگیزییە لە سەدەی هەژدەدا. حکومەتی کەرگیزیا ساڵی ١٩٩٥ یادی هەزار ساڵەی ئەو داستان و قارەمانەی کردەوە. داستانەکە لە سێ بەرگدا نووسراوەتەوە و ژمارەی بەیتەکانی نیوملیۆن بەیتە. ماناس لەناو شاری "بێشکەک"ی پایتەختی کەرگیزیادا مۆنۆمێنتێکی بۆ دروست کراوە. (ویکیپیدیا)

٣٤. بێجگە لە شەنی دار؛ شەنی ئاسنیش هەیە کە ئەویش چوار پەنجەی هەیە، جۆرێکیش سێ پەنجەی هەیە، پێی ئەڵێن "سێلک".

٣٥. بۆ ڕەنگەکانی تر، پاشگری "باو" ئەچێتە سەریان وەکوو: سووورباو، زەردباو، شینباو، بەڵام بۆ سپی ئەڵێن "سپیواش".

٣٦. ولاخی بەرزە کە کورتان یان جل یان زینی لێ ئەکرێت، بە سێ هۆکار، قایش یان پەت لەسەر پشتی جێگیر ئەکرێت: یەکێکیان لەژێر سکیەوە بۆ ئەوەی بەمدیودیودا نەکەوێت، ئەوەیان "تەنگە"یە. یەکێکی تریان لە دواوە لەژێر کلکیەوە، بۆ ئەوەی لە سەرەوخوارکەدا نەخزێ بۆ سەر ملی، ئەوەیان "پاڵوو"ە. ئەوی تریشیان

لەژێر ملیەوە لەسەر سنگی ئەبەستریت، بۆ ئەوەی لە سەرەوژوورکەدا نەخزێ بۆ دواوە، ئەوەشیان "بەرۆک"ە.

پەندێکی کوردی ئەڵێت: "من هەر ئەیکەمەوە بە بەرۆک، ئەو ئەبێتەوە بە پاڵوو."

٣٧. کەرەستەیەکی سەر خەرمانە دروست وەکوو خاکەناز، بەڵام ئەم دەمەکەی پانتر و لاکێشەییە، لە تەختەیەکی سفتی زۆر تەنک دروست ئەکرێت، کە دانەوێڵەکە سوور ئەبێت؛ پێی هەڵئەدەنەوە بۆ ئەوەی بڵاو نەبێتەوە.

٣٨. شەلاقە: باڵندەیەکی ئاویی قاچ درێژی دەنووک درێژی سپییە.

٣٩. کەنگر کە پیر ئەبێت و تۆو ئەکات و وشک ئەبێت.

٤٠. لە هەندێ ناوچەی گەرمیان وەک مەیدان و قۆرەتوو، بە سرووت ئەڵێن قەسەڵ.

# جەنگیز ئەیتماتۆڤ



جەنگیز ئەیتماتوڤی کەرگیزی، جووتیار و کرێکاری سەردەمی منالّی و دواتر کارمەند و ڕۆژنامەنووس و بالّوێز و پەرلەمانتار و نوێنەری ولاّتەکەی بۆ کۆڕ و کۆبوونەوە و دەزگا نێودەولّەتییەکان و ئەندامی سەرکردایەتیی حیزبی شیوعیی سۆڤێتی. یەکێکە لە مەزنترین نووسەرەکانی جیهان و بە نووسەری "مرۆڤ و کولتوور و سروشت" ناسراوە. بەرهەمەکانی لە ڕۆژهەلاّت و ڕۆژئاوا و باکوور و باشووری گۆی زەوی بۆ نزیکەی ١٦٠ زمان وەرگێڕدراون و ئەوەندەی من پێی گەیوم، زیاتر لە ٦٠ ملیۆن کۆپییان لێ

فرۆشراوە و چەندین خەڵاتی بەرز و بەرچاوی ڕووسی و جیهانیی پێ بەخشراوە.

لەبەر ئەوە ئاسان نییە لە زمانێکدا بیدۆزیتەوە چەند کەس وەریانگێڕاوە و چەند جار چاپ کراوەتەوە و باشترینیان کامەیانە، هەر بۆ نموونە پێنج کەسی جیا و لە شوێنی جیا و لە کاتی جیادا کردوویانە بە ئەڵمانی و یەکی چەند جار چاپ کراوەتەوە.



منیش دوای ئەوەی کاک ئارامی خاوەنی "ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان" داوای لێ کردم لە ئینگلیزییەوە بیکەم بە کوردی، دوو سەرچاوەم دەست کەوت:

یەکەمیان لە وەرگێڕانی پرۆفیسۆر "جەیمس ڕییودان"ی ئینگلیزی کە ساڵی ٢٠٠٨ چاپ کراوە، بەڵام

بۆم داونلۆد نەکرا و ئەتوانی تەنیا چەند لاپەڕەیەکی بە ئۆنلاین بخوێنیتەوە.

ئەم پیـاوە کەڵەگەتێکـی کەتەیە، بەگەنجـی یـاریزانی تـۆپی پـێ، ڕۆژنـامەنووس، ڕاگەیانـدنکار، تـوێژەری ئەدەبـی، چـاودێری سیاسـی، مامۆسـتای زانکـۆ و چیرۆکنووسـی منـاڵان و ڕۆماننووسـێکی ناسـراوی دنیـایە. نـزیکەی سـەد کتێبـی چـاپکراوی هەیە. زمـانی ڕووسیی لە بەریتانیا خوێندووە و دواتر پێنج ساڵ لە ڕووسیا ژیاوە و یاریی بۆ یانەیەکی مۆسکۆ کردووە و لە نـزیکەوە جەنگیـز ئەیتمـاتۆڤی ناسـیوە و برادەرییـان هەبووە.



لە بـارەی ئەیتمـاتۆڤەوە؛ ڤیـدیۆیەکی ٨:٤٠ دەقیقەیـی هەیە، کە ئەمە لینکەکەیەتی:

NQFN_MMvRtvhttps://www.youtube.com/watch?v=

**ئەم سەرچاوەیەیە کە بەشێک لە لاپەڕەی یەکەم و کۆتایی لەبەر دەستتدایە.**

"پرۆفیسۆر ئیرەجی بەشیری" ئامادەی کردووە بۆ ئینتەرنێت و من ئەمەم کردووە بە کوردی.

ئەم سەرچاوەیە "فەیننا گلۆگۆلیڤا" کردوویەتی بە ئینگلیزی. ئەم وەرگێڕە ڕووسییە (کە دڵنیاش نیم ئافرەتە یان پیاوە!)، بەڵام مەزەندە ئەکەم ئافرەت بێت، هیچم لەسەر ژیاننامەی دەست نەکەوت بیناسێنم، تەنیا ئەوەندەیە زیاتر لە حەفتا بەرهەمی ناوازەی کردووە بە ئینگلیزی و نووسیوە، تیایاندا هەیە زیاتر لە (٤٠٠) لاپەڕەیە.

منیش نەهاتووم شتێک بنووسم بە زمانی ئەدەبی ڕۆژنامەگەریی شارستانی تەنیا بیخوێنیتەوە (کە بێگومان زۆر شارەزام تیایدا)، بەڵکوو بەدڵی ئەیتماتۆڤ و لە چاوی ئەوەوە؛ ئەتبەمە گوندەکەی جەمیلە و گوێیان لێ بگریت چۆن ئەدوێن و ورد بیتەوە و بە چاوی خۆت دەروبەرەکە ببینیت.

بۆیە ئەم وەرگێڕانەم بە زمانی ئاخاوتنی کوردیی لادێیانە داڕشتوە، کە خۆشبەختانە زۆر جیاواز نییە لە زمانە ئەدەبیەکە، جگە لەوەی ڕاستگۆیانە: پاراوترە، شیرینترە، دەوڵەمەندترە، لە وێنە و هەست گەیاندندا ڕاستگۆترە، بەڵام عەیبەکەی لەوەدایە پەروەردەی

شارستان و نەوەی نوێ کە لە لادێ نەژیاوە و بەرکەوتەی لەگەڵ کارکردن و کەرەستەکان و دابونەریتەکەیاندا نەبووە؛ ئاسان تێناگات.

**ئەم بەرهەمەم بەم شێوەیە نووسیوە، بە مەبەستی ئەوەی:**

- لەپاڵ زمانە ئەدەبییەکەماندا، بەشێکی تر لە مۆسیقا و وێنە و وشە و دەستەواژەی شیرین و پاراو و پەتی بخەمە بواری بەکارهێنانی ئەدەبی.

- بیسەلمێنم زمانی ئاخاوتنی کوردییش پێزی ئەوەی هەیە بابەتی ئەدەبیی پێ بنووسین و کەسانێک لە خۆیان ڕائەبینن شیعر و چیرۆک و ڕۆمان و شتی تری پێ بنووسن.

- بیکەم بە قاسەیەک، کۆمەڵێک وشەی ڕەسەنی تیا بپارێزم.

- ئەدیبان و نووسەران و زمانەوانەکان هان بدەم دوو بەرەی وتووێژ دروست بکەن و یەکلایی بکەنەوە ئەم بۆچوونە دروستە یان ڕەد ئەکرێتەوە!

ڕۆمانەکانی جەنگیز زوربەیان کراون بە فیلمی سینەماییش، یەکێک لەوانەش ئەم "جەمیلە"یە. ئەوەندەی من بەدوایدا گەڕاوم، بە (ڕووسی، فەڕەنسی، ئەڵمانی،

هندی) کراوه به فیلم. من حەزم ئەکرد ئینگلیزییەکە ببینم، بەڵام بەحوکمی پاراستنی مافی بڵاوکردنەوە؛ تەنیا دیمەنێکی ٦:٣٨ دەقیقەیی واڵایە کە ئەمە لینکەکەیەتی:

https://www.youtube.com/watch?v=BBY٢uJH٥٩q٨

بەڵام فیلمە ڕووسییەکەی کە بە ڕەشوسپییە، بەتەواوی دائەبەزێت و بۆ ساغکردنەوەی ناوەکان و تێگەیشتنی تۆپۆگرافییەکەی سەیرم کردووە. ئەمەش لینکەکەیەتی:

https://www.youtube.com/watch?v=uDk_TOzgAg

٤

ئەم هەویرە ئاو زۆر ئەبات... ئومێدەوارم لە بەرهەمی شەشەمی جەنگیز ئەیتماتۆڤدا، هەر بەم زمانە، جارێکی تر یەک بگرینەوە.

تۆفیق عەبدول

٢٠١٩/٣/١٧

سلێمانی

وێنەی بەرگی چاپی یەکەمی ڕۆمانی ((جەمیلە)) لە
تاجاکیستان لە ساڵی ١٩٥٨.



فەرموو لەگەل وێنەی بەشێک لە سەرچاوەکە:

Jamila

by Chingiz Aitmatov

Translated by Fainna Glagoleva

Prepared for the Internet by Iraj Bashiri,

٢٠٠٢




Once again I find myself in front of the small painting in a simple frame. Tomorrow morning I leave for the village,

and I gaze long and intently at the canvas, as if it can give me a word of advice for the journey ahead .

It has never been exhibited. Moreover, when relatives from home come to visit, I make sure it is out of sight. There is nothing to be ashamed of, though it is not really a work of art. It is as plain as the earth depicted in it .

The background is a patch of bleak autumn sky with the wind chasing fast-moving skewbald clouds over the far mountain range. The russet wormwood-covered steppe, a road black and damp from the recent rains, and the dry broken bushes of needle glass crowding at the roadside form the foreground. The footprints of two travellers follow a washed-out dirt road. Their tracks appear ever fainter as the road dwindles in the distance.

My Jamila, you left with never a backward glance. Perhaps you are tired, perhaps you have lost faith in yourself? Lean against Daniyar, let him sing you his song of love, of the earth, of life. May the steppe reflect it and blossom in every hue and colour! May you recall that August night! Keep on, Jamila, never regret what you've done, for you have found your difficult happiness !

As I look at them I hear Daniyar's voice. He is calling to me to set out, and that means it is time for me to prepare for the journey. I will cross the steppe to my native village and will find new colours there .

May my every brush-stroke resound with Daniyar's song! May my every brush-stroke echo the sound of Jamila's beating heart !



هێندەی ئەوەی بەشێک لە ڕۆمان و شانۆنامە بەکوردیکراوەکانی "تۆفیق عەبدول"م خوێندوونەتەوە، بە "جەمیلە"شەوە، ئەگەر هاتبا و ناوی نووسەری یەکەمی لەسەر نەبووایە، ئەوا ڕێک دەمگوت وەرگێڕ خۆی نووسیونی، چونکە بەبێ ئەوەی دەستکاریی ناوەڕۆکی کردبێت یان ڕووداوەکان بە ئارەزوو و خواستی خۆی بگۆڕێت، هێندە بە زمانێکی پاراوی کوردی کاری لەسەر کردوون؛ ڕێک وەک ئەوە وایە نووسەرێکی کورد بە شارەزاییەکی زۆری زمانەوە ئەو تێکستەی نووسیبێت.

بەڕێز عەبدول، بە پێچەوانەی هەندێک وەرگێڕی ترەوە، لەپێناو وەرگێڕاندا نایەت خۆی بخاتە بۆتەی دەستەواژەی وشکوبرینگەوە، بەڵکوو ماندوو دەبێت و دەگەڕێت بەشوێن دۆزینەوەی دەستەواژەیەکدا کە پڕ بە پێستی مەبەستەکەی بێت، تا لە کاتی خوێندنەوەدا خوێنەر وەڕس نەکات.

بەڵێن سالح




لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی ەدیبان